ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم

# تامەزرۆی تێگەیشتنی

# قەدەرم

قەدەر چییە؟ (قەزا) بۆ چی؟ ئایا راستە هەرچی روودەدات لە قەدەرماندا نووسراوە؟



با پرسیارەکانتان
بێ وەڵام
نەمێننەوە!



ئۆزکان ئۆزە

زنجیرەی ئەو پرسیارانەی
تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم

# تامەزرۆی تێگەیشتنی قەدەرم







ئۆزکان ئۆزە



ناوی کتێب: تامەزرۆی تێگەیشتنی قەدەرم

نووسینی: ئۆزکان ئۆزە

وەرگێڕانی: ئاوات عبداللە بابان

پێداچوونەوەی: بەفراو جەمال + دۆستی عوسمان

نۆرەی چاپ: یەکەم ٢٠١٥

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٧٠٨)ی ساڵی ٢٠١٥ ی پێدراوە

# پێڕست



پرسیارەکانم لەبارەی قەدەرەوە:

# سەرەتا

سڵاو!

ئـەم پـەرتووكـە پێكـدێت لـەو پرسـیارانەی تـۆ دەربـارەی قـەدەر دەیانكەیت و وەڵامەكانی من بۆیان.

قەدەر بابەتێكی كەمێك قورسـە و، لـەم كتێبـەدا وەڵامـی تـەواوی پرسـیارەكانتم لەبارەیـەوە نەداوەتـەوە. بـەڵام هـەوڵم داوە پایـە بنەڕەتی و هەرە گرنگەكانت تێبگەیەنم. ئـەوەی دەمێنێتـەوە، ئیـدی لـەداهاتوودا خـۆت وەڵامیـان دەدەیـەوە، چـونكە زانیاریگـەلێك لێـرە فێریـان دەبیـت، یارمەتیـدەرت دەبـن بـۆ ئـەوەی لـەداهاتوودا خـۆت بتوانیت وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەیتەوە كـە دەربـارەی قـەدەر بـۆت دێنەپێش.

لەڕاستیشدا كاتێـك دەسـتمكرد بـە ئامادەكـاری بـۆ ئـەم كتێبـەی بەردەستت، ئامانجم وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارەكانی سەبارەت بە

قـەدەر نـەبوو؛ بـەڵکو ئامـانجم شـیکردنەوە و تێگەیانـدنت بـوو لـەم چەمکە فراوانەی کە زۆرجـار لێـرە و لـەوێ تەنانـەت لـەنێو گـۆرانی و هەڵبەسـتەکاندا و بەدەسـتوری "شـەلم کـوێرم ناپـارێزم" پێناسـە دەکرێت.

خۆ گەر بەڕاستی بتوانم ئەم بابەتەت بۆ شی بکەمەوە، ئەوا ئومێد دەکـەم بەدرێـژایی تەمـەنت هـەر گرفـت و پرسـیارێکت بێتـە بـەردەم لەچوارچێوەی قەدەردا، ئیتر لات سەخت و ئاڵۆز نەبێت...

ئـەم پەرتووکـە بـەر لەچـاپدانی دوو شـارەزای بوارەکـە پێیـدا چوونەتەوە، بۆیە دەکرێت بە ئاسوودەیی بڵێم: "لەوانەیە کەموکوڕیی هەبێت، بەڵام هەڵەی تێدا نییە"...

ژمارەیەك سەرچاوەی بـەپێز هـەن کـە لـەکاتی ئامـادەکردنی ئـەم زنجیرەیەدا هەمیشە لەبەردەستمدابوون و زانیاریم لێوەرگرتوون. هەر زوو زوو لاپەڕەکانیانم هەڵدەدایەوە و بەدوای ڕوونکردنەوە و نموونەی جواندا دەگەڕام تاکو تۆی پـێ تێبگەیەنم.

وتم پێدەچێت تـۆش لـە داهـاتوودا حەزبکـەیت ئـەو پەرتووکانـەی بـاسمکردن بخوێنیتـەوە، بۆیـە تـەنیا نـاوی چـەند دانەیـەکیانت بـۆ دەنووسم:

١- (پەیامی قەدەر)ی بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسی.

٢- (قەدەر چییە؟)ی محمد کرکنجی.

٣- (وتووێژێك دەربارەی قەزاو قەدەر)ی عەلائەدین باشار.[١]

بەهیوای بەیەکگەیشتنەوەمان لە کۆتا پەرتووکی زنجیرەی "ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەکانیانم"دا...

ئۆزکان ئۆزە

---

١- ئەو سەرچاوانەی نووسەر ئامـاژەی پێکـردوون، یەکـەم و سـێیەم؛ واتـە: (پـەیامی قەدەر)ی بەدیعوززەمان سـەعیدی نوورسـی و (وتووێـژێك دەربـارەی قـەزا و قـەدەر)ی عەلائەدین باشار- وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی کوردی.

# قەدەر چییە؟

(بەڕاستی ئێمە هەموو شتێکمان لەسەر ئەندازە و هەڵسەنگاندن و بە پێی حیکمەتێك دروست کردووە) القمر: ٤٩

**سەرەتای تەمەنی لاوێتیم بوو، هیچ زانیارییەکم دەربارەی قـەدەر نەبوو. بەڵام ئیدی وای لێهات زوو زوو ئەم وشانە زۆر ببیستم:**

**"چ بکەم ئیتر، قەدەرەکەم وابوو..."**
**"داماوە بووە قوربانی دەستی قەدەر، هێشتا لاو بوو..."**
**"ئاییـا من چ بڵێم لەگەڵ ئەم قەدەرەدا..."**

**هەرکات وشەی قەدەر لە زاری کەسێك دەردەچوو، هەروەك چۆن کەروێشـکێك لـە دارسـتان بـە بیسـتنی کسـپە و خشـپەیەکی کـەم گوێقـوڵاخ دەبێـت، منـیش هـەروا هەڵوێسـتێکم بـۆ دەکـرد و لـە چواردەورم دەڕوانی.**

هـەوڵم دەدا لـەوەی دەیڵـێن تێبگـەم و، لەوەشـدا کـە تێدەگـەم واتایەك بۆ قەدەر بدۆزمەوە، بەڵام هەوڵەکانم مایەپوچ بـوون؛ چـونکە ئـەوەی دەمبیسـت نـەك تـەنیا مانـای قـەدەری پـێ نـەدەوتم، بـەڵکو دەیشیکردە چەمکێکی هەرگیز واتا نەزانراو...

**"قەدەرە ئیدی، چی لەگەڵ دەکەیت؟!"**
**"کابرای چارەڕەش چ بکات، ملکەچی قەدەرەکەی بوو".**
**"قەدەری من وەك هیی کەس تر نییە".**

واتـە ئـەو خەڵکـە بەشـێوەیەك لـە قـەدەر دەدوان، وەك بڵێیـت بەڵایەکە و دواجار بەرۆکی هەموو کەسێك دەگرێت...

**"ئیدی قەدەرەکەمان وابوو... ".**
**"ڕووی قەدەر ڕەش بێ... ".**
**"قەدەر بەڕوومدا پێنەکەنی... ".**

قەدەر وای کرد، قەدەر وای نەکرد.. بە کورتییەکەی هەمووان لـە قەدەر ناڕازیبوون و سکاڵایان لەدەستی دەکرد...

کێ گرفتێکی بۆ دروست بێت، کێ کاروباری خراپ بێت، کێ نەخۆش بکەوێت، کێ دەستی بە دەرگاوە ببێت، کێ زیان بکات و سەروەت و سامانی لەدەست بچێت، بێویژدانانە ئۆبالّی دەخاتە ئەستۆی قەدەرەوە...




بەجۆرێك خالّە شەمالّیش –پاسەوانە لە کارگەکەی گەڕەکی ئەوبەر و موچەکەی سەرچاوەی بژێویی خێزانەکەیەتی– کاتێك بلیتی یانصیب دەکڕێت و بۆی دەرناچێت، ڕۆژێ بێ سکالاّکردن لەدەستی قەدەر بەسەرنابات!

خۆ کەسێکیش نابینێت بڵێت، خاڵە تۆ هەق وایە لەبری گلەییکردن لە قەدەر گلەیی لە خۆت بکەیت...

ئایا ئەم تانانەی لە قەدەر دەدرێن، تا چەند تانەی ڕەوان؟

لە هەمووشی گرنگتر، ئایا قەدەر خۆی چییە؟

ئەوانەی ئاه و ناڵەیانە، لە کێ تووڕەن و چی تۆمەتبار دەکەن؟

سەرەتای قۆناغی لاوێتیم بوو و تامەزرۆی تێگەیشتن بووم لە قەدەر. سواری هەر پاسێکی ناوشاریش دەبووم هەمان گۆرانی لێدەدرا: "هەردەم تاڵ و مەینەتە ژیانم، هەرچەند دەبینم مەحکومی قەدەرم..."

## ئەگەر خراپەکان هیی قەدەرن، ئەدی چاکەکان؟

کە بیرم لە قەدەر دەکردەوە یەکەم شتێك کە هەستم پێدەکرد، وتنی ئەم وشەیە بوو کاتێك خەڵك ڕووداوێکی ناخۆشی بەسەردا دەهات هەردەم لەسەر زمانیان دەبوو. هەرکاتێکیش هەموو شتێك باش بەڕێوەبچووایە و کێشەیەك نەبووایە، ئیدی بیری قەدەریان نەدەکەوتەوە.

من ئەوکات بەخۆمم دەوت: "قەدەر شتێکە تەنیا پەیوەستە بە ڕووداوە خراپەکانەوە؟"

بۆ وێنە: "ڕووداوی هاتوچۆ، نەخۆشی، مردنی کتوپڕ، زیانی بازرگانی و هەژاربوون، تێوەگلان لە گۆمەزی نەخوازراودا! ... هتد"

بێگومان مرۆڤ کاتێک لە چواردەوریدا کەسێك نابینێت لە قەدەرەکەی ڕازی بێت و پێی دڵشاد بێت، ئیدی بەم جۆرە بیردەکاتەوە...

ماوەیەکی زۆر لە تەمەنم لە زەینمدا (قەدەر) هۆکاری تەواوی ڕووداوە ناخۆش و خراپەکان بوو کە تووشم بووبوون، یاخود لە داهاتوودا تووشم دەبوون. دواتر بیرم کردەوە: ئەی دەبێت ئەم هەموو شتە خۆش و باشەی تر کە هەیە لە کوێدا جێبکەینەوە؟

بۆ نموونە: کاتێك ئەوەندە گەورەبووم بچمە سەر پەلی درەخت، دارهەنجیرێك ڕێك لە پشت ماڵمانەوە بوو و هەر زوو دەستم پێی گەیشت و پێویستی نەکرد بچمە ئەوپەڕی شار بۆ دۆزینەوەی درەختێك...

ڕاکشانم لەژێر سێبەری دارتووەکاندا لە ڕۆژانی گەرمی هاویندا...

ئاشنابوونم لەگەڵ ئەو هەموو باڵندەیەدا، دەستهێنانم بە سەری پشیلەکاندا...

خوانی بەیانیان و هەنگوین و کەرە و هێلکەوڕۆن، سفرەی ئێواران و یاپراخی گەڵامێو...

ئەمە لەگەڵ ئەوەی هەموو ئەو کەسانەی خۆشم دەویستن و وابەستەیان بووم لە چواردەوری خوانەکە ئامادەبوون...

واتە لە ژیانمدا چەندین شتی جوانی هاوشێوە هەبوون، دیارە ئەوانیش ئیدی قەدەری من بوون، چونکە هەروەك چۆن نەخۆشی قەدەرە، تەندروستیی باشیش بە هەمان شێوە قەدەرە.

ماڵئاوایی و پێك شادبوونەوە بە هەمان شێوە...

لەدەستدان و وەدەستهێنان هەردووکیان قەدەرن...

دەوڵەمەندی قەدەرە، هەژارییش هەروەها...

لەدایکبوون وەك مردن قەدەرە...

بەم شێوەیە، وابزانم ئیدی ئەوکات مانای قەدەرم دۆزیبووەوە: "قەدەر، هەرشتێکە کە بەسەرمان دێت! باش و خراپ، جوان و ناشیرین، ڕاست و چەوت.. هەرشتێکمان هەبووبێت یاخود لەداهاتوودا نەمانبێت..!".

خۆ ڕاست بلێین، ئەمە بەگوێرەی وەلامەکەی پێشتر گەلێك ڕاستتر بوو، بەلام زۆریش کەموکوڕیی هەر هەبوو؛ چونکە قەدەر تەنیا چەمکێکی پەیوەندیدار نەبوو بە ژیان و ڕووداوەکانی نێو تەمەنی مرۆڤەوە. بەڵکو هەموو شتێك قەدەرێکی خۆی هەیە!

مەبەستم هەموو شتێکە بێ جیاوازی، لە سەری نینۆکێکەوە تاکو چیا مەزنەکان، لە پەپوولەیەکەوە کە بەیانی لە قۆزاخەکەی دێتەدەرەوە و ئێوارە دەمرێت تاکو تەمەندرێژترین زیندەوەری ئەم هەسارەیە -کە درەختی هەمیشەسەوزی "سیکویا" یە- قەدەری خۆیی هەیە.



## هەموو شتێك قەدەری خۆی هەیە

هەموو شتێك لەم گەردوونەدا پێوانە و بڕێكی خۆی هەیە. خاڵی دەستپێك و كۆتایی هەیە، ڕێگا و سنوورێكی دیاری هەیە، ژمارەیەك كە نە سەردەكات و نە ژێر، قاڵبێك كە دەوروبەری گرتووە، چونكە خودا، هەموو شتێك بە قەدەرێك بەدیدەهێنێت. قەدەریش بە واتای *"پێوانە و بڕ"* دێت...

ئێستا پەڕەیەكی كاغەز بهێنە، دەستێكت لەسەری دابنێ و پەنجەكانت ئەوەندەی دەتوانیت بكەرەوە، پاشان بە پێنووس وێنەی

دەستت بکێشە... دواتر دەست لەسەر کاغەزەکە هەڵگرە و سەیرێکی وێنە کێشراوەکە بکە. ئەو هێڵانە ئیدی سنوورەکانی دەستی تۆن.

تۆ هێشتا لە ڕەحمی دایکتدا مۆڵێکی خانەی شێوەنەگرتوو بوویت، ئەم سنوورانە دیار بوون.

خودا لە قەدەری خانەکانتدا نووسیی کە ژمارەیەك خانە ببنە دڵ، هەندێکیش ببنە گورچیلە، بەشێکیان گەدە، هەندێکی تریش مێشك، لە قەدەری بەشێکی دیکەی نووسی دەست و قاچ و...هتد.

ئەو خانانەی لە قەدەریاندا نووسرابوو ببنە دەست، لەدەوری یەك خڕبوونەوە.

ژمارەی ئەو خانانەی بڕیاربوو ببنە پەنجە، بە تێپەڕبوونی کات زۆر بوون و زۆربوون، تاکو گەیشتنە ئەو ڕادەیەی پێویستە...لەم نێوەندەدا، تەنیا خانەیەکیش ئەو سنوورەی نەبەزاند کە بۆی دیاریکرابوو.

پەنجە، لەو شوێنەی پێویست بوو دەستی بە دروستبوون کرد و لەو شوێنەی پێویست بوو درێژبوونی ڕاوەستا... نە پەنجە تووتە درێژتر بوو نە دۆشاومژە کورتتر لەوەی پێویست بوو ببێت...

بە ڕووکەش هیچ پێوەرێك نەبوو سەرەتای دروستبوون و کۆتایی درێژبوون، درێژی و کورتیی هەریەك لە پەنجەکان، شێوەی جیاوازی پەنجەگەورە لەوانی دیکە دیارییبکات.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان قەدەرێکیان بۆ دیاریکرابوو. بەدیهێنەر هەموو شتێکی بە قەدەرێك بەدیدەهێنا؛ قەدەریش مانای "پێوەر" و "بڕ"ی هەیە...

ئەگەر ئافەرێنەر قەدەرێکی بۆ پەنجەکانمان دیارینەکردایە، ئەوا نەدەبووینە خاوەنی دوو دەستیی لەم شێوەیە کە بتوانین لە کاروباری ڕۆژانەدا بەکاریبهێنین.

ئەگەر خانە سەرەتاییەکان بێ بەرنامە و سەرەڕۆ و سەربەخۆ بوونایە و هەریەك بەلایەکدا بچوونایە، ئەوا دەستێك بە پێنج پەنجەوە و پەنجەکان بەم ئەندازە درێژ و کورتانە پێکنەدەهاتن تاکو بشێن بۆ گرتنی پێنووس. کەچی بڕوانە قاڵبی نەبینراو و قەدەریان چەند جوان و ڕێکوپێك دەست و پەنجەکانیان نەخشاندووە، چونکە هەموو شتێك قەدەرێکی خۆی هەبووە.

کاتێك لە سکی دایکتدا خانەکان وێکدەهاتن بۆ دروستکردنی پەنجەی دەست و قاچت، لەسکی پشیلەیەکی خرپندا خانەکان

کۆدەبوونەوە بۆ دروستکردنی پەنجەی تیژ و بەتوانا بۆ بێچووەکانی، چونکە لە قەدەری ئەواندا بوونە پەنجەی تیژ نووسرابوو.

واتە دەستی خڕوخەپۆڵی منداڵێکی ساوا جیاواز بوو لە چنگی توکن و تیژی بێچووە پشیلەیەک...



هەریەک لەوان ئەندازە، ژمارە، درێژی و شێوازی جودای خۆیان هەبوو، چونکە قەدەری نووسراوی دەست و پەنجەی منداڵ جودا بوو لە قەدەری چنگی بێچووە پشیلە.

لەهەمان کاتدا لەنێوئاخنی هێلکە داڵێکدا، زیندەوەرێکی دیکە بە قەدەرێکی تەواو جیاواز لەوانی دیکە دەئافرێنرا. لە قەدەری ئەودا: (دروستبوونی دوو باڵی پان و درێژ بۆ فڕین، دوو چاوی تیژی وا کە لە

بەرزایی ئاسمانەوە مشکی کێڵگە ببینێت و ڕاوی بکات، دەنووکێکی تیژی کەوانەیی) هەبوو.

لە هێلکەیەکی دیکەدا کۆمەڵێك خانە لە چوارچێوەی قەدەر و ئەو ئەندازە و پێوانانەی بۆیان دیاریکرابوو دەبوونە ڕیشوەکەوانە و، کلك و پوولەکە بۆ ژیانی سوورەماسییەکی ناو دەریا.

هەموو شتێك قەدەرێکی خۆیی هەیە...

تۆوی ژمارە دواییـنـەهاتووی نـاخی زەوی؛ هەر دەنکۆڵەیەك هاوشێوەی تیانووس (دەفتەر)ێکە بۆ پێنووسی پەنهانی قەدەر...

فێنکە سپێدەیەکی مانگی نیسان کاتێك دڵۆپە بارانێکی لەقەدەر نووسراو "تۆو" لە ئاسمانەوە داباری، ئیدی دانە دانە ئەو وشانەی دەبوو لە تیانووسەکەدا بە "تۆو" بنووسرێن، دەستیان کرد بە نووسینەوە...

لە قەدەری یەکێك لە تۆوەکاندا بوون بە گوڵە بەیبوون نووسرابوو..

لە قەدەری دانەیەکی تر دار چنار..

هەم بەیبوون پێگەیشت هەم چنارەکەش گەورە بوو، بەڵام باڵای هیچ بەیبوونێك نەگەیشتە باڵای چنار. هیچ دارچنارێکیش بەقەد بەیبوون کورت دەرنەچوو.

بەیبوون وەك بەیبوون گردۆڵکە سەوزەکانی دەنەخشاند، دارچناریش وەك ئەوەی چاوەڕوانی لێدەکرا بەرەو بەرزایی ئاسمان هەڵیدەدا..

هەر زیندەوەرێك لە زەوی و ئاسماندا هەبوو، هەموو بەپێی ئەندازە و پێوانەیەك دەهێنرانە بوون...

هەموو شتێك خاڵی سەرەتا و کۆتایی، ڕێیەکی دەستنیشانکراو، ژمارەیەکی دیاریکراو کە نە سەردەکات و نە ژێر، سنوور و چوارچێوەیەکی هەیە کە لەناویدا هەڵدەسوڕێت...

دەستی منداڵ، چنگی پشیلە، باڵی هەڵۆ، ڕیشوەکەوانەی ماسی، ڕەنگی گوڵ و گوڵزار، تامی میوە، خولگەی ئەستێرە و هەسارەکان، ئەمانە هەموو قەدەری هەریەك لەو بوونەوەرانە بوون...

پەروەردگار، هەموو بوونەوەرێك بە گوێرەی قەدەرێك دەخولقێنێت؛ قەدەریش مانای "*پێوانە*" و مانای "*بڕ*"ی هەیە...



## ڕێکەوت و بەخت بوونی نییە، قەدەر هەیە!

بێگومان ئەم واتا ڕاستەقینە و فراوانە بۆ کەسێکی وەك من -کە تەنیا لە گۆرانی و ئاخاوتنی ئاساییدا گوێم لە وشەی قەدەر بووبوو- شتێکی سەرسوڕهێن و ناباو بوو.

**تومەس، هەر شتێك قەدەرێکی هەیە و قەدەریش هەموو شتێك لەخۆ دەگرێت.**

لەم گەردوونەدا هەر شتێك هەبێت، بە ویستی خودای تاقانە دەبێت.

ئەوانـــەی بـــەردەوام دەخولێنـــەوە وەك ئەســـتێرە و ئـــەلیکترۆنی چواردەوری ناوکی خانە، لەبەرئەوەی خودا وا فەرمانی کـردووە بۆیـە دەخولێنەوە. ئەوانـەی ڕاوەسـتاون و چەقبەسـتوون، خـودا فـەرمانی کردووە بۆیە لەشوێنی خۆیان ناجووڵێن.

خانەکان بە فەرمانی خودا دابەش دەبن و لەچوارچێوەی سنووری ئەو قەدەرەی خودا نووسیویەتی وێکـدێن بـۆ دروسـتکردنی کۆرپـەی باڵندە، مێش هەنگ، گوڵەباخ، پەپوولە، فیل یاخود مرۆڤێك.

هیچ شتێك لەخۆوە و بێ دەسـتوور پێکنایـەت. خـۆ پێکهاتنیشـی مومکین نییە..

پارچە قوماشێك لـەخۆوە و بـێ ئـەوەی بەرگدروویـەك هـەبێت بـۆ ئەندازەگرتن و بڕینی، هەرگیز کراسی لێ دروست نابێت.

زینـدەوەرانی لـەژمارە نـەهاتووی سـەر ئـەم زەویـە، هەریەکـە و بـەرگێکی لەبـەرکراوە کـە هـەم قەشـەنگە و لێـی هـاتووە هـەم بـۆی گونجاوە.

مرۆڤ پێسـتێکی نایـابی دووراوە بـە بـەردا، هـەروەك چـۆن ورچـی قوتبەکان خوری، مێروو قاوخ، ماسی پوولەکە و باڵندە پەڕی هەیە.

گەر گشت بەرگدرووانی جیهان کۆبوونایەتەوە نەیاندەتوانی لە ڕەگەوە تا لووتکەی پەلەکانی، جلێکی هێندە بێکەموکوڕی هەڵدروونە بەر درەختێک، کەچی خودای خاوەن زانست و دانست، بەرگی گونجاوی کردووەتەبەر هەموو ڕووەك و گژوگیایەك.

بەگوێرەی پێداویستیی بوونەوەرە جیاوازەکان و گونجان بۆیان، یەکێك بەرگی ئەستوور، یەکێك نەرم وەك لۆکە، یەکێك دڕکاوی، یەکێك ڕەق وەك بەرد و یەکێکی تر بەرگێکی ناسك وەك پەڕی گوڵی هەیە.

لەڕاستیدا تەنها ڕووخساری دەرەوەی زیندەوەران بەسە و سەروزیادیشە بۆئەوەی نیشانمان بدات هیچ شتێك لەخۆوە و بەڕێکەوت دروست نەبووە، بەڵکو هەموو شتێك بەگوێرەی نەخشە، بەگوێرەی پێوانە و بڕ، واتە بەپێی "قەدەر"ێك بەدیهاتووە...

هیچ شتێك لە گەردووندا بێسەروبەر یاخود زادەی ڕێکەوت و بەخت نییە، بەڵکو قەدەرێکی هەیە.

قەدەریش مانای *"پێوانە"* و مانای *"بڕ"ی* هەیە...



# ئیرادەی سەربەست

ڕاستە هەموو شتێك قەدەرێکی خۆی هەیە، بەڵام ئایا قەدەری درەختێك، مێروولەیەك یاخود ئەستێرەیەك هاوشێوەی قەدەری مرۆڤێکە؟

قەدەری درەختێك بوونە بە درەخت، قەدەری مێروولەیەك بوونە بە مێروولە، قەدەری ئەستێرەیەك بوونە بە ئەستێرە، قەدەری مرۆڤێکیش بوونە بە مرۆڤ.

مرۆڤ بوون شتێکی تەواو جیاوازە لە بوون بە بوونەوەرێکی دیکە...

تۆوێك کە لە قەدەریدا بوونە سێو نووسراوە، کاتێك چەکەرە دەکات و پاشان پێدەگات، بەرەکەی سێوە.

ناتوانێت بڵێت: "نەخێر من نامەوێت سێو بگرم، بەڵکو دەخوازم هەرمێ بگرم".

وردیله مێروویەك كه له قەدەریدا بوونه مێروولـه نووسـراوه ناتوانێـت بڵێت: "ڕاسته وەك مێرووله بەدیهێنراوم، بەڵام من وەك ئەوانی دیکـه ناکرێت لەبەیانیەوه تاكو ئێواره خەریکی کۆکردنەوەی دەنکه گەنم و نانەورده بم. دەمەوێت کارێکی دیکـه بکـەم.. نـا! ئەسـڵەن نامـەوێت کاربکەم".

هەرچی مرۆڤیشه، له تەمەنیدا سەربەست کـراوه و بژاردەگـەلێکی جیاواز هەرله سپییەوه بـۆ ڕەش خراوەتـه بـەردەمی، ڕێگـای جیـاواز هەر له ڕاستەوه بـۆ چـەپ و لـه سـەرەوه بـۆ خـوارەوه لەبەردەمیـدا واڵاکراوه بۆئەوەی بیگرێتەبەر.

واته مرۆڤ، جیاواز له درەخت و مێروو و ئەستێرەکان، ئیرادەیەکی ئـازادی هەڵبـژاردنی پێـدراوه: لـەنێوان چـاکه و خراپــەدا، لـەنێوان کارکردن و نەکردنـدا، لـەنێوان چـوون و نەچـووندا، لـەنێوان ڕاسـت و چەوتدا، لەنێوان دادپەروەری و ستەمدا، لـەنێوان حـەڵاڵ و حەرامـدا، لەنێوان پاداشت و سزادا، بگره لەنێوان باوەڕهێنان به خودای تاقانـه یـاخود بێباوەڕیـدا مـاف هەڵبـژاردنی هەیـه، لـەو ڕێگایـەی بۆخـۆی هەڵیدەبـژێرێت ڕێگـا تــەی دەکـات و لەسـەر ئـەو ڕێچـکەیه ژیـانی بەسەردەبات.

بەڵێ، قەدەری ئێمەی مرۆڤ بەم شێوەیە بوو.

•••

سڵاو هاورێ.. لە پەرتووکی "تامەزرۆی ناسینی بەهەشتم"ەوە لەیەك دابڕاوین. منیش بێ ئەوەی لە حاڵ و کەیفت بپرسم ڕاستەوخۆ چوومە ناو بابەتی قەدەرەوە.

لەڕاستیدا ئەگەر وردبینەوە دەبینین، پرسیارەکانی مرۆڤ دەربارەی بابەتی قەدەر، بەگشتی پەیوەندیدارن بە ژیانی خودی کەسی پرسیارکەر و قەدەرەکەیەوە.

کتومت وەك ئەوانەی تۆ...

بەڵام ڕوونکردنەوەی مانای قەدەر کە لەم بەشەدا باسمکرد، بناغەیەکە بۆ وتووێژەکانی دواترمان؛ چونکە هەتا نەزانین مانای قەدەر چییە، پرسیارکردن دەربارەی و گەڕان بەدوای وەڵامەکەیدا واتایەکی ئەوتۆی نابێت...

بڕێك لەو دەستەواژانەی لەم بەشەدا ئاماژەم پێداون، لە هەندێ بەشی داهاتوودا داوات لێدەکەم وەبیر خۆتیان بهێنیتەوە.



# "قەزا" یانی چی؟

ڕۆژانێك كە سەرقاڵی فێربوونی واتای قەدەر بووم، وشەی "قەزا"ش هاتە بەردەمم.

ئێستا من هەوڵدەدەم مانای "قەزا"ت بۆ ڕوون بكەمەوە.

كاتێك دەوترێت:"قەزا"، دەستبەجێ ڕووداوێكی وەك: (ڕووداوی ئۆتۆمبێل، كەوتنەخوارەوەی پەرداخێك و شكانی، كێشانی چەكوشێك بە دەستدا لە كاتی بزمار داكوتیندا) دێتە بەرچاوت.

ڕاستە ئەمانە قەزان، بەڵام قەزا تەنیا بریتی نییە لەمانە..

قەزا واتە: "بە فەرمان و بەدیهێنانی خودا، هاتنەبوونی ئەو شتانەی لە قەدەردا نووسراوە لە ڕۆژ و كاتی خۆیدا".



ئەوەی لە قەدەردا نووسرابێت و پاشان بە فەرمان و دەستەڵاتی خودا بێتەبوون، پێی دەوترێت: "قەزا". هەر لەبەرئەوەشە هەمیشە پێکەوە ناویان دەبرێت:"قەزا و قەدەر".

ئەگەر قەدەر بچوێنین بە نەخشەی کارێک، ئەوا قەزا بارە جێبەجێکراوەکەی ئەو نەخشەیەیە.

گوڵکردنی تۆوێک لە بەهاردا، بەرهەمهاتنی سێو لەسەر لقی دارسێوێك، لەدایکبوونی منداڵ، هەڵاتن و ئاوابوونی خۆر، ئەمانە هەموو قەزان.

قەدەر هەموو بەدیهاتوویەکی ڕابردوو و داهاتوو، هەموو ڕووداوێکی پێشتر و ئێستا و پاشتر لەخۆدەگرێت. بەڵام قەزا تەنیا ئەو ڕووداوانەیە کە ڕوویانداوە و ئەو شتانەیە کە بەدیهاتوون.

بۆ نموونە ئەو شتانەی ئەمڕۆ ڕوویاندا هەم "قەدەر"ن هەم "قەزا"، بەڵام ئەوەی سبەینێ ڕوودەدات تەنیا لە "قەدەر"دا هەیە.

ئێستا با بزانین لە قەدەری تۆدا، پرسینی چ پرسیارگەلێك هەیە و، لە قەدەری منیشدا، چ وەڵامگەلێك بۆ ئەو پرسیارانە هەیە.



# ئایا ڕاستە هەموو شتێك كە ڕوودەدات لە قەدەرماندا نووسراوە؟

نەك تەنیا ئەوانەی ڕوویانداوە، بەڵكو ئەوانەشی كـە ڕوودەدەن لـە دەفتەری قەدەردا نووسراون.

خـودای تـاك و تـەنیا، زانایـە بـە تـەواوی خانـە و پێكهاتـەكانی جەستەمان؛ چونكە زاتی ئەو بەدییهێناون.

خـودای مـەزن زانایـە بـە هـەر كارێـك لەژیانمـدا دەیكـەم، هـەر هـەنگاوێك هەڵیـدەنێم، هـەر دەنگێـك لـە دەمـم دێتـەدەرەوە، هـەر سەدایەك دەیبیسـتم، هـەر بۆنێـك لـووتم بـۆنی دەكـات، هـەر وشـە و

پـەیڤێك دەینووسـم، بـۆ نموونـە: (ئـەم وشـانە و ئەوانەشـی دواتـر دەیاننووسـم). هـەر هەناسـەیەك هەڵیدەمـژم، هـەر قومـە ئاوێـك دەیخۆمەوە، هەر پـارووە خواردنێـك دەچـێتە گەدەمـەوە، خۆشـی و ناخۆشـییەكانی ڕێـی تەمـەن، ئـەو پرسـیارانەی دەیانكـەم و وەڵامەكانیان، ڕاست و چەوت، ئـەو ڕێگایـەی لەسـەری دەگـوزەرێم و دوا مەنزڵم، تاوان و چاكەكانم، كاتی مردنم، دوارۆژم كە ئایا بەهەشـت بێت یان دۆزەخ.. هەموو ئەمانە و لە دەنكە لمی ڕۆخـی دەریاكانـەوە تا دەگاتە گەلـە ئەسـتێرەكانی بۆشـایی ئاسمـان، هـەموو لـە بازنـەی زانستی ئەزەلی و ناكۆتای پەروەردگاردان.

بەرلەوەی بێینە دنیاوە، خودا دەیزانی چۆن ژیانێكمـان دەبێـت و چی دێتە سەر ڕێمان.

مـرۆڤ وەك ئـەوەی لـە قەدەرەكەیـدا نووسـراوە، چـاو بـە دنیـا هەڵدێنێت و دەژی، كەواتە دەكرێت بڵێین: "قـەدەر: زانسـتی خـودای گەورەیە بـە هـەموو شـتێكی ڕابـردوو و داهـاتوو، ئـەوەی ڕوویـداوە و ئەوەشی ڕوودەدات، ئەوەی بـەدیهاتووە و بەدیـدێت، بەدیهاتنیشـیان بەگوێرەی ئەو زانستە".

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "هەر یەکێك لە ئێوە کە خودا دروستی دەکات، چل ڕۆژ بە تۆمی (نوطفەیی) لە سکی دایکیدا کۆدەکرێتەوە و دەمێنێتەوە ئنجا بە چل ڕۆژی تریش دەبێت بە پارچە خوێنێکی مەیيو، ئنجا بە چل ڕۆژی تریش دەبێت بە پارچە گۆشتێك بە قەد پارووێك، ئنجا گیانی بە بەریدا دەکرێت، جا خودای گەورە فەرمان دەکات بەو فریشتەیە کە گیان دەکات بەبەریدا، کە ئەم چوار وشەیە بنووسێت، یەکەم: ڕزق و ڕۆزیی چییە و چی نییە، دووەم: ئەجەل و ئاکامی کەیە و کەی نییە، سێیەم: کاروکردەوەی، چوارەم: بەدبەخت و بەدکار دەبێت یا کامەران و بەختیار دەبێ." [١].

## ئایا دەکرێت بەدیهێنەر زانا نەبێت بە بەدیهاتووەکەی؟

بەرەبەیان بوو، ئاسمان خۆرەتاو، بۆ پیاسە کردن چوومە کەنار دەریاکە.

شنەبایەکی فێنکی دەهات. مشتم پڕکرد لە لمی کەنار دەریاکە و بەرەو ڕووی بایەکە هەڵم دا.

---

١- صحيح البخاري: ٣٢٠٨.

هێزی بایەکە لمەکەی لەدەستم فڕاند، بەجۆرێك کە هەر دەنکۆڵەیەکی بە لایەکدا بڵاو کردەوە.

دەنکۆڵەکانی ئەو لمەی تۆزێك پێش ئێستا لەچنگم گرتبوو، ئیدی با بردنی و تێکەڵی هەزاران و ملیۆنان دەنکە لمی دیکەی کردن.

ڕێك لەو کاتەدا شتێکی سەیر هات بە خەیاڵمدا:

"ئەبێ کام دەنکە لم لەو ژمارە زۆرەی لمی کەنار دەریاکە –کە هەر لە هەزاران ساڵەوە لەوێدان– لە قەدەری نووسرابووبێت من ئەمڕۆ لە چنگی دەگرم و پاشانیش بەربای دەدەم؟".

وتمان خودا هەموو شتێك دەزانێت. باشە "هەموو شتێك" ئەم مشتە لمەش دەگرێتەوە؟

هەروەك چۆن لە قوڵایی ئەو دەریایەدا شتێکی وشك نابینیت، ئاواش شتێك نییە لە سەر زەوی و ئاسمانەکاندا خودا نەیزانێت.

ئەمە چۆن؟

هەموو شتێك لەچوارچێوەی زانستی ئەودایە، چونکە ئەو هەموو شتێکی بەدیهێناوە.

*"ئایا دەکرێت بەدیهێنەر نەزانێت چ ڕوودەدات...؟"*

دڵـم بـڕوای بەمـە هـەبوو، ئـەقڵم بەڕاسـتی دەزانـی، بـەڵام شـتێك لەناخمــەوە دەیــوت: "باشــە، چـۆن؟ ئایـا بەڵگەیــەك هەیــە؟". بەپێویستم دەزانـی بەڵگەیـەكی بەرجەسـتە لەبەرچـاوم بێـت.. واتـە بەڵگەیەك لەسەر زانسـتی ناكۆتـای خـودا، بەڵگەیـەك لەسـەر ئـەوەی بێجگـە لـە لمەكـەی نـاو چـنگم زاتـی ئـەو ئاگـای لـە هـەموو دەنكـە لمەكانە.

ئـەو ڕۆژە تـاكو ئێـوارە وێڵـی وەڵامـی ئـەم پرسـیارە بـووم، لـە مێشكمدا دەمهێنا و دەبرد.. لەم شەنوكەوەی خەیاڵمدا شەو داهات.



دووریـم لـه شـار و ڕووناکیی گڵۆپـەکانی شـار باشـتر ڕێیـدام درەوشـانەوەی ئەسـتێرە گەشـەکانی ئاسمـان ببیـنم، لـه ڕۆخـی دەریاکەدا لەسەر پشت ڕاکشام. بینیم نه تـەنیا ژمـارەی دەنکه لمی ئەم کەنار دەریایە، بەڵکو زیاتر له ژمارەی دەنکه لمی کـەنار تـەواوی دەریاکانی سەرزەوی، ئەستێرە له ئاسماندا هەیە.

ئەو بەڵگەیەی بەدوویدا دەگەڕام دۆزیمەوە، ئیدی بـه ئاسـوودەیی توانیم ئەم وەڵامە دەست بخەم:

"سەر هەڵبڕە و سەیرێکی ئاسمانی بەرین بکە! تۆ هاتوویت باسی مشتێك لمم بۆ دەکەیت و دەپرسیت کە: ئایا خودا ئاگای لـەو مشـتە لمە هەیە کە بەربات دا؟ ئەمە لەکاتێکدا، پـەروەردگار زیـاتر لـه لمی ژێر پێمان بە ڕاسەرمانەوە ئەستێرەی وەدیهێناوە.

هیچ کام لەم ئەستێرانە بێ ڕێڕەو و وێڵەکی نییە، بەڵکو هەریەکـە و خولگەیەکی خۆیی هەیە. خودا خولگەی بۆ هەر ئەستێرەیەك دیاری کردووە..

ئایا ئاسمان بەڵگەیەك نییە لەسەر زانستی خودای تاقانە کـە هـەر له دەنکۆڵە لمەکانەوە تاکو ئەستێرەکانی ئاسمان لەخۆ دەگرێت؟".

*خودای گەورە دەفەرمووێت: (جا خوداش بڕیاری ئاسمانەکانی دا بە حەوت ئاسمان لە ماوەی دوو ڕۆژدا و لە هەر ئاسمانێکدا کاروباری دایە دەست فریشتەی کارپێسپێراوی خۆی و، ئاسمانی خوارووی لە ئەرزەوە نزیکمان ڕازاندەوە بە چرای ئەستێرەکان بۆ جوانی و بۆ پاراستنی لەو شەیتانانەی بۆ گوێ ڕاهێڵ کردن لە دەنگوباسی ئەو ئاسمانە نزیک دەکەونەوە. ئەمەیە بڕیاری خوای خاوەن عیززەتی زانا بە هەمووشتێك)* فصلت: ١٢ .

سەیر بوو! ئیدی ئەو پرسیارەی لە بەیانییەوە مێشکمی داگیرکردبوو ڕەویەوە. چنگێك لمم هەڵگرت و بەرەو ئەستێرەکان هەڵمدا.

ئیدی هیچ گومانێکم نەبوو لەوەی خودای تاك و تەنها ئاگای لە هەموو دەنکە لمە لێك جودابووەکان هەیە.. بۆیە لەناخەوە هەستم بە ئاسوودەیی باوەڕهێنان بە زانست و دانستی ناکۆتای بەدیهێنەرەکەم دەکرد؛ چونکە هەم دەنکۆڵەکانی لم، هەم ئەستێرەکانی ئاسمان بەو شێوەیە دەجووڵانەوە کە زانستی خودا لە گەردووندا نەخشاندبوونی.

ئەمەش قەدەری ئەوان بوو. قەدەریش: "زانستی خودای گەورەیە بە هەموو شتێکی ڕابردوو و داهاتوو، ئەوەی ڕوویداوە و ئەوەی ڕوودەدات، ئەوەی بەدیهاتووە و بەدیدێت، بەدیهاتنیشیان بەگوێرەی ئەو زانستە".

ئیتر باشتر لەمە تێگەیشتم.. واتە تێگەیشتن لەوەی هەرچییەك بۆم ڕوویداوە و ڕوودەدات لە قەدەرمدا نووسراوە، ئیتر ئاسانتر بوو.

خودا خاوەن زانستێکی ناکۆتایە و هیچ شتێك نییە لە گەردووندا لەدەرەوەی بازنەی ئەو زانستەیدا بێت.



# ئایا مرۆڤ مەحکومی دەستی قەدەرەکەیەتی؟

ئەم پەرتووکە شەشەم پەرتووکی پرسیار و وەڵامی من و تۆیە، بێگومان ئەگەر لە قەدەریدا چاپکران و بڵاوبوونەوە هەبێت... تەواو نازانم من لە وەڵامدانەوەدا پێشکەوتنم بەخۆمەوە بینیوە یان نا... بەڵام بێ گومان تۆ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پرسیاری زیرەکانەتر دەکەیت!

من هەمیشە شتێکم دووپاتکردووەتەوە، ئەویش ئەوەیە: ئەگەر پرسیارێك لە مێشکتدا دروست ببێت بێگومان لەبەرئەوەی وەڵامێکی هەیە بۆیە لات دروست بووە.

"مـادەم هـەموو شـتێك لـە قەدەرمانـدا نووسـراوە، مـادەم بـە قەدەرێکی نووسراوەوە چاو بە دنیا هەڵدەهێنین.. کەوایە هیچ شـتێك نییە لەدەستی ئێمەی مرۆڤدا بێـت! بـەمجۆرەش دەبینـە مـەحکومی دەستی قەدەر".

– باشە ئایا هەر بەڕاستی ئێمە مەحکومی دەستی قەدەرین؟

– بەڵێ، بەڵام چۆن مەحکومییەك؟

کێ دەبێتە دایك و باوکمان، بەروار و شـوێنی لـەدایکبوون، نـەژاد، ڕەگەز، باڵا، ڕەنگـی پـرچ، ڕەنگـی چـاو، ژمـارەی پێمـان و ...هتـد، هەموو ئەمانە لە قەدەرماندا نووسراوە؛ بـەڵام هـیچ کـام لەمانـە وەك بژاردە نەخراوەتە بـەردەممان تـاکو مـافی هەڵبـژاردنی ئـەو جۆرەمـان هەبێت کە بەدڵمانە، بـەڵکو خـاوەن ویسـت و بەدیهێنـەری هـەموویان خودای گەورەیە.

ئەگەر بڕیارە ئەو دەستەواژەیە هەر بەکاربیەین، ئەوا بەڵێ ئێمەی مرۆڤ مەحکومی ئەم لایەنەی قەدەرین کە باسمان کرد.

لەبـــەر بەخشـــندەیی ئـــەوەی لـــە جیهـــانی تـــەنگ و تـــاریکی "نـــەبوون"ەوە هێنایینییـــە جیهـــانی"بـــوون"، ئێمـــە تـــەنیا شوکرانەبژێریمان لەسەرە، چونکە لە نەبوونەوە هاتنەبوون و نەبوونە

بەرد، خاك، درەخت، گژوگیا، مشك، مێش...، بەڵكو بوونە مرۆڤ خۆی لەخۆیدا بەخششێكی مەزنە.

شوكرانەبژێریی شیاو با لەولاوە بوەستێت، تەنانەت تەواو ناتوانین لە واتای ئەم بەخششە گەورەیە تێبگەین.. گەر تۆزێك تێڕابمێنین بۆ گرێدانی خۆمان بە قەدەرەوە، لەبری "مەحكوم" وشەی "سوپاسگوزار" هەڵدەبژێرین.

"بەڵێ، پەروەردگارا سوپاسگوزارین! سوپاسگوزارین لەقەدەرماندا بوونە مرۆڤت نووسی، بەڕاستی منەتبارتین...".

شتگەلێكی دیكەش هەن لە ژیانماندا كە بێ ئەوەی پرسمان پێ بكرێت ڕوودەدەن، بۆ نموونە: لێدانی دڵ، سووڕی خوێن بەناو مولوولەكاندا، هەرسكردنی خۆراك لە گەدەدا، كار و خەباتی خانە – كە هەندێكیان ئۆكسجین دەگوازنەوە و هەندێكیان دوانەئۆكسیدی كاربۆن–.. هەموو ئەمانە بە ویست و توانستی خودای گەورە هەڵدەسوڕێن، ئێمە تەنانەت پەییشی پێ نابەین و ئاگامان لێ نییە. هەموو ئەو شتانەشی ئاگامان لێی نییە و ڕوودەدەن، هەموو لە قەدەرماندا نووسراون.



هەر هەناسەوەرگرتن و دانەوەیەك قەدەرە، هەر لێدانێكی دڵ قەدەرە...

بەڵێ، ئەگەر هەر دەتەوێت ئەو دەستەواژەیە بەكاربهێنیت، وایە، مەحكومی ئەم لایەنەی قەدەرین. بەڵام ڕوونە كە ئەم مەحكومییەتەمان بە قازانجی ئێمەیە، ئەی وا نییە؟

هەروەها ژمارەیەك پێداویستیی ژیانیمان هەیە بۆ وێنە: ئاو خواردنەوە.. واتە قەدەرمان وایە.

دەتوانیت بەمە بڵێیت: "مەحكومی ئاوم"، دەشتوانیت بڵێیت: "پێویستم بە ئاوە"، واتە جیاوازییەكی وای نییە بڵێیت: "مەحكوم" یان "پێویستیی"..

ئەمدیوە لە گەرمەڕۆژێکی تەممووزدا کەسێکی تینوو بچێتەسەر سەر کانییەکی سازگار، تێرتێر ئاوی فێنك بخواتەوە، ئنجا سنگی خۆی بکوتێت و ڕوومەتی بڕنێت ئەمە چییە وەڵا "مەحکومی ئاو خواردنەوە"یە...

بەپێچەوانەوە؛ بیستوومە پاش ئاوخواردنەوە وتراوە: "ئۆه، سوپاس بۆ خودا. بەڕاستی ئاو بەخشینێکی بەبەهایە. ئەو زاتەی نیعمەتی خواردن و خواردنەوەمان پێدەدات، مەزنترینە".

کە دەپرسیت: "ئایا ئێمە مەحکومی قەدەرین؟"، ئەگەر مەبەستت ئەمانەیە، بەڵێ مرۆڤ وابەستەی ئەم ڕووەی قەدەرەکەیەتی.

ناتوانین دایك و باوك، شوێنی لەدایکبوون، نەژادمان هەڵبژێرین.

خودا چۆن خواستی لەسەر هەبووبێت، وا لە قەدەرماندا نووسراوە. ئێمە بمانەوێت و نەماونەێت، ئەندامەکانی جەستەمان خۆنەویستانە کاردەکەن. گەر هەواڵیان بزانین یان نەزانین ئەوان درێژە بە خەباتی خۆیان دەدەن.



خواردن دەخۆین، ئاو دەخۆینەوە، سوود لە زۆربەی نیعمەتەکانی سەر زەوی وەردەگرین. بۆیە ئەگەر تۆزقاڵێك بیری لێبکەینەوە لەبری "مەحکومین"، دەستەواژەی "سوپاسگوزارین" هەڵدەبژێرین.

دەی ئیدی کاتی ئەوە هاتووە وەڵامی پرسیارەکەت بدەینەوە کە هەر لەسەرەتای گفتوگۆکەمانەوە کردبووت.

تۆ پرسیت: "*مادەم هەموو شتێك لە قەدەرماندا نووسراوە، ئیدی بۆچی کاتێك کاری چەوت و خراپ دەکەم، تاوانبار منم؟ خۆ ئەگەر لە قەدەرمدا نەنووسرایە ئەو کات منیش چەوتکاریم هەڵنەدەبژارد؟*

*مـادەم خـودا دەزانێـت چ دەكـەم و بەوپێیـەش لـە قەدەرمـدا نووسیویەتی، ئیتر گوناهی من چییە! خـۆ كـارێكم لەدەسـت نایـەت، چونكە لە قەدەرمدا نووسراوە؟"*.

هیچ دڵ لەدڵ مەدە، هەریـەك لـەم پرسـیارانە وەڵامێكیـان هەیـە، بەڵام بەرلەوە شتێك هەیە دەربارەی قەدەر پێویستە باسی بكەین.

بابەتێك دەربارەی قەدەر كە نابێت قەت باسی لێوەبكەین!



# چ لێکدانەوەیەك دەربارەی قەدەر مەترسیدار و ڕێگەپێنەدراوە؟

یـەکێك بـوو لـە ڕۆژە خۆشـەکانی سـەردەمی خۆشـگوزەرانی[1].
ژمارەیەك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەدەوری یەك خڕبووبوونـەوە و بەگـەرموگوڕی گفتوگۆیـان لـەبارەی قەدەریانـەوە دەکـرد. لـەپڕ پێغەمبەری نـازدار ﷺ دەرکـەوت و پەسـت بـوو لـەوەی بـەم جـۆرە مشـتومڕ لـەبارەی قـەدەرەوە دەکـەن، بۆیـە مناقەشـەکردنی لەسـەر

---

١- سەردەمی خۆشگوزەرانی، خۆشبەختی: مەبەست لێی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانی ڕاشیدینە. بە عەرەبی پێی دەوترێت (عصر السعادة).

بابەتی هاوشێوە قەدەغەکرد. فەرمووی: "ئەوانی پێش ئێوە بەم جۆرە موناقەشەیان دەکرد بۆیە بە تیاچوون سزادران"[1].

ئەی باشە ئێمە کە ئێستا باسی قەدەر دەکەین، هەڵەمان کردووە؟

ئایا بەم کارە سنووری خۆمان تێپەڕاندووە؟

## "خودا دەزانێت، ئێوە نازانن"

هەر لە کۆنەوە زانایانی مەزنی ئیسلام پەرتووکیان دەربارەی قەدەر نووسیوە و لێکیان داوەتەوە. بێگومان ناکرێت ئەو زانایانە ئاگاداری هۆشدارییەکەی پێغەمبەر ﷺ نەبووبن یاخود زانیبێتیان و گوێڕایەڵییان نەکردبێت.

بابەتی قەدەر، هاوشێوەی تەواوی بنەماکانی دیکەی ئیمان لە ئیسلامدا قسەی لەسەر دەکرێت، باوەڕداران پرسیاری لەبارەوە دەکەن و وەدوی وەڵامەکەشی دەکەون، بەڵام لایەنێکی قەدەر هەیە موناقەشەکردنی لەنێوان مرۆڤەکاندا شتێکی دروست نییە؛ چونکە

---

١- سنن ابن ماجه: ٨٢.



هەروەك چۆن چاوی مرۆڤ توانای بینینی هەموو تەنێکی نییە، گوێچکەی توانای بیستنی هەموو دەنگێك و، دەستی توانای درێژبوونی بۆ هەموو شتێك و، قاچی توانای ڕۆیشتنی بە هەموو ڕێگایەك و، شانی توانای هەڵگرتنی هەموو بارێکی نییە، هەرواش ژیریی مرۆڤ توانای تێگەیشتنی لە هەموو چەمکێك نییە.

بۆ نموونە کەسانێك لەوانەیە پرسیاری ئەوەی: "ئایا بۆچی نەك سەردەمێکی دیکە بەڵکو ئێستا هاتوونەتە دنیاوە" ببێتە خولیای مێشکیان!

بەڵام پێویستە بزانین، بێجگە لە بەدیهێنەرەکەمان –کە لە نەبوونەوە هێناینیە بوون و پاشان کردینی بەو مرۆڤەی ئێستا هەین– کەسی دیکە هۆکاری ئەمە نازانێت.

هەندێك جار من گازندەم دەکرد لەوەی "بۆچی لە سەردەمی خۆشبەختیدا نەژیام و ئێستا لەم سەردەمدا هاتوومەتە دنیاوە؟"..

دیاربوو هەستی خۆشیی ژیان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و، هاودەمیکردنی و، بینینی ڕووخساری و، بیستنی دەنگی و، ماچکردنی دەستی پیرۆزی پاڵی پێوەنابووم بۆ ئەم بۆچوونە. دروست بیرنەکردنەوە دەربارەی ئەوەی خودا بۆچی لەو سەردەمەدا بەدیینەهێناوم، وایکرد کەم کەم دەنگی ناڕەزایی لە ناخمدا بەرزبێتەوە.

ماوەیەك هەر دەموت و دەموتەوە: " ئاخ! خۆزگە لە سەردەمی پێغەمبەردا دەژیام! باشە من بۆچی لەم سەردەمەدا دەژیم؟".

لەبری ئەوەی هەردەم سوپاسگوزاریم بەرامبەر ئەو قەدەرەی خودا پێمی بەخشیوە، کەچی بەپێچەوانەوە، ناڕازیبووم! بە ئەقڵی ناکامم، سووربووم لەسەر ئەوەی ئەگەر لە سەردەمی خۆشبەختیدا ژیابام لە ئێستام باشتر دەبوو، بەڵام خاڵێکی زۆر بنەڕەتیم

لەبیرکردبوو، ئەویش: لە سەردەمی خۆشبەختیدا هەموو کەسێك خۆشبەخت نەبووبوو. خۆ ئەبوبەکر و ئەبوجەهل، هەردووکیان لەسەردەمی خۆشبەختیدا دەژیان.

ئەی من چۆن هێندە دڵنیام لەوەی ئەگەر لەو چاخەدا ژیابام دەبوومە هاوەڵی پێغەمبەرﷺ؟

خودا بمانپارێزێت، دەکرا یەکێك بوومایە لەو بێباوەڕانەی لە شەڕی بەدردا شمشێریان لە پێغەمبەر ﷺ هەڵکێشا.

ئەی باشە ئەم ئەگەرەی کە ئێستا دوای (١٤٠٠) ساڵ بیری لێدەکەمەوە مووەکانم گرژدەبن؛ یەکێك نەدەبوو لە ئەگەرەکانی چارەنووسی من؟

بەڵام ئەوەتا هەنووکە هەست بە ئاسودەییەکی وا دەکەم، دەڵێی کەشتییەکم لە شەپۆلە زەبەلاحەکانی دەریا ڕزگاربووم و گەیشتوومەتە کەناراوی سەلامەتی.

ئایینی ئیسلام هات و سەردەمەکانی ڕۆشن کردەوە، وەك تاجێك چووە سەر سەری جیهان. ئیدی منیش چاوم بە دنیایەکی وادا هەڵهێنا و پێویستە سەرەتا ستایشی ئەمە بکەم.

بەڵێ ڕاستە (١٤٠٠) ساڵ دوورم لە بینینی پێغەمبەر ﷺ بە چاوی ئاسایی و بوون بە هاوڕێی هاوەڵانی، بەڵام ئەوەندەش دوورم لەوانەی بێشەرمانە دوژمنایەتییان دەکرد.

لەکاتێکدا بەردەوام مەودای نێوان خۆم و بێباوەڕان فراوان دەکەم، هاوکات بە یادکردنەوە و شوێنکەوتەبوون خۆم لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی نزیکتر دەکەمەوە. واتە بوونم لەم سەردەمەدا باشترینە بۆ من!

گەورەترین چاکەش ئەوەیە خودا لە قەدەرمدا "هاتنە دنیا"ی نووسیوە.

ڕەخنەگرتن لەوەی "با لەبری ئەم سەردەمە لەو سەردەمەدا بژیامایە، لەبری ئەم وڵاتە لە فڵان وڵات بهاتمایەتە دنیاوە" شتێکی شیاو نییە بۆ مرۆڤی ژیر. بێگومان خودای تاقانە زانایە بەوەی چی باشترینە، نەك من.

*خودای گەورە دەفەرموێت: (لەوانەیە شتێکتان پێ ناخۆش بێت، کەچی خێری تێدابێت بۆتان، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت، کەچی زیانتانی تێدا بێت. خودا بە نهێنیی کار دەزانێت و دەزانێت چی خێری تێدایە بۆتان، ئێوە نایزانن)* البقرة: ٢١٦.

خۆ ئەگەر هێشتا بڵێیت من خوازیارم لەسەردەمی پێغەمبەردا ژیابام و یەکێك بوومایە لە هاوەڵان، ئەوا من بە ئایەتێك وەڵامت دەدەمەوە:

*خودای گەورە دەفەرمووێت: (گەیشتن بەم لێخۆش بوون و بەم بەهەشتە فەزڵ و لوتفی خودایە بە هەرکەسێکی دەدات کە خۆی مەیلی لێ بێت و، خودا خاوەنی فەزڵ و لوتفی گەورەیە)* الحدید: ٢١.

هیچ کاتێك ناتوانین تەواو تێبگەین لە هۆکاری بنەڕەتیی هاتنەدنیامان لەم سەردەم و وڵاتە و ڕەگەزمان ئایا کچ بێت یان کوڕ. خۆ ئەمانە هەموویان ویستی بەدیهێنەرەکەمانی لەسەرە.

بەم جۆرە پێشەوامان ڕێنماییمان دەکات موناقەشەی ئەم لایەنەی قەدەر نەکەین، چونکە ناگەینە هیچ دەرەنجامێك، تەنانەت ڕایسپاردووین هاودەمیی ئەوانەش نەکەین کە موناقەشەی لەسەر دەکەن.

# بۆچی بەشێك لە مرۆڤەكان هەژارن و ئەوانی دیكە دەوڵەمەندن؟

(ئێمە تاقیتان دەكەینەوە و دووچاری هەندێ ترس و برسێتی و كەمیی دارایی و مردن و كەمیی بەروبوومتان دەكەین، تا بزانین كێ خۆگر دەبێ و كێ بێزاری دەردەبڕێت. ئەی موحەمـمەد موژدە بدە بە خۆگرەكان كە خودای گەورە ڕووی میهرەبانیی لێیانە و ڕەحمەتیان بەسەردا دەبارێنێت*ئەو خۆگرانەی كاتێ تووشی بەڵایەك دەبن بێزار نابن و ڕەخنە لە كاری خودا ناگرن و دەڵێن: ئێمە هەمووومان موڵكی خوداین و لە پاشەڕۆژیشدا بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە، چیمان بەسەردێنێت ئارەزووی خۆیەتی) البقرة: ١٥٥-١٥٦.

سـەردەمێك پادشـایەك هـەبوو. بـێ ئـەوەی هـیچ پێویسـتیی بـە گەلەكـەی بێـت، خـەڵات و دیـاریی بـەنرخی پـێ دەبەخشـین، بـەڵام بەیەكسانی و هەمان دیاریی نەدەدایە خەڵك، بەڵكو بیویسـتایە چـەند بداتە هەركەسێك ئەوەندەی دەدایە، لەبەر حیكمەت و دانایـیەك كـە

تەنیا خۆی پێشوەخت دەیزانی، زۆری دەبەخشییە هەندێك کەس و کەمی دەبەخشیە بەشێکی دیکە.

بەشێك لە گەل بێ گوێدانە کەم و زۆریی بڕی دیارییەکان دەیانوت: "ئەمە دیاریی پادشایە. دیاریی پادشایەك کە دەبەخشێت بێ ئەوەی مەجبوری بەخشین بێت، کەواتە کەم و زۆریی تێدا نابێت"، خەڵاتەکەیان ماچ دەکرد و دەیانخستەسەر سەریان و سوپاسگوزارییان نیشان دەدا.

هەرچی بەشەکەی دیکەی گەلەکەشە خەڵاتی خۆیان و ئەوانی دیکەیان بەراورد دەکرد و هەمیشە سکاڵایان دەکرد: "ئەم پادشایە بۆ وا دەکات، زۆر دەداتە ئەوان و کەم بە ئێمە. دەبێت دادوەری لە کوێی ئەمەدا بێت؟".

بەهۆی ئەوەی هەردەم چاویان لەسەر بەشی کەسانی دیکە بوو، بۆیە بەشەکەی خۆیانیان نەدەبینی. وەك بڵێیت پادشا ناچارە خەڵاتیان بکات.

ئەمە لە کاتێکدا نە پادشا ناچاربوو خەڵات بداتە کەس، نە کەسێك مافی هەبوو بەزۆر داوای خەڵات لە پادشا بکات.

ئەمە چیرۆکێك بوو، وەرە ئێستا لە ڕوانگەی ئەم چیرۆکەوە سەیری پێدەشتی وەڵامەکان بکەین و وەڵامی دروست بۆ پرسیارەکەی تۆ ببینینەوە.

- بەڕای تۆ پادشا ستەمی کردووە کە زۆری دەبەخشیە کەسانێك و کەمی بەوانی دیکە دەدا، ئایا نادادگەریی کردووە؟

- نەخێر، چونکە ستەم و نادادگەری کاتێك دەبێت کە شتی کەسێکی دیکە زەوت بکەیت یاخود لات بێت و نەیدەیتەوە، بەڵام خەزێنەکانی پادشا تەنیا هی خۆی بوون. کەسی دیکە پشکدار نەبوو تێیاندا. هەروەها ئەم بەگوێرەی ویستی خۆی خەڵاتی بەخشیوەتە خەڵك. واتە کەس بۆی نییە بڵێت بۆچی پادشا کەمی داوە بە من و زۆر بە کەسێکی دیکە، چونکە خۆ پادشا ناچار نییە خەڵات بداتە خەڵکی. ئەگەر ببەخشێت، ئەوا لە بەخشندەیی خۆیەتی.

مرۆڤیش بەهەمان شێوەیە. خودای تاك و تەنها بێ هیچ ناچاری و پێویستییەك مرۆڤی لە نەبوونەوە هێنایەبوون. واتە خودا مرۆڤی وەك بەرد، درەخت یاخود مشکی کێڵگە بەدینەهێنا، بەڵکو وەك مرۆڤ هێنایەبوون.

چاوی بۆ بینین، گوێچکەی بۆ بیستن، زمانی بۆ ئاخاوتن و لـووتی بۆ بۆنکردن پێبەخشی.

ڕووناکی، دەنگ، بۆن و تامی بەدیهێنا...دەستی بۆ گرتن و قاچی بۆ ڕۆیشتن پێدایـن.

خۆ دەکرا زیندەوەرێکی خۆڵ خۆر بووینایە، بەڵام ئەو زاتە خۆڵی دەرخـواردی درەخـت دا و لەسـەر پەلـەکانی میـوەی بـۆ ئێمـە شۆڕکردەوە.

دەکرا زیندەوەرێکی گیاخۆر بووینایە، بەڵام ئەو گیای دەرخـواری ئاژەڵان دا و شیری ئەوانیشی پێشکەشی ئێمە کرد.

خـۆ دەکـرا بـێ ئـەوەی بـزانین هـەنگوین چییە بـژین، بـەڵام ئـەو مێروویـەکی چـکۆلەی بـەناوی "هـەنگ"ەوە بـەدیهێنا و هـەنگوینی پێشکەش کردین کە شیرینترین و بەسوودترین خۆراکە.

ئەگەر تەنیا یەك میوە –بۆ نموونە سێو–ی بەدیبهێنایە، ئەو کات بە مێشکی کامماندا دەهات بڵێین: "باشە سێو خۆشە، بەڵام چ دەبوو ئەگەر لە هاویندا میوەیـەکی ئـاوداری شـیرینی گـەورە هەبووایـە بـەو گەرمایە نۆشمان بکردایە"؟

ئەی پێم نالێیت خودا چ پێویستییەکی بە بەدیهێنانی تام و بۆن و ڕەنگ و شێوەی جیاواز هەیە؟

پەروەردگار، چواردەورمانی بە تام و بۆنی جیاواز، سەوزە و میوەی فرەچەشن، گوڵ و گوڵزار و درەختی هەمەجۆر ڕازاندووەتەوە... لە هەموو ئەمانە گرنگتر مێشکی خستە ناو کاسەی سەرمان و ژیریی پێبەخشین، کە بەهۆیەوە بوونی خۆمان و بوونی زاتی خۆیی پێناساندووین.

ئایا گەر مرۆڤ لەناو ئەم هەموو ناز و نیعمەتەدا هاوشێوەی سکاڵاکەرانی ناو چیرۆکەکە تەماشای ماڵ و سامان و ئۆتۆمبێل و پارەی کەسانی دیکە بکات و گازندە بکات بڵێت: "بۆچی نەیدایە ئێمەش؟"، نەنگی نییە؟



*خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: (خـودای گـەورە ئێـوەی لەسـکی دایکتان دەرکردووە لە حاڵێکدا کە هیچتان نەدەزانی. هەروەها هێزی بیستن و بینین و دڵی بۆ دروست کردوون بەڵکو شوکرانەبژێریی خـودا بکەن)* النحل: ٧٨.

ئەوەی دەکەوێتە سـەر ئێمـەی مـرۆڤ سوپاسـگوزارییە لەبەرامبـەر ئـەو هـەموو بەخشـندەییەی خـودا کـە بـێ ئـەوەی هـیچ ناچـار بێـت دەیاننوێنێت، نەك سـکاڵاکردن لەوانـەی پێـی نەبەخشـیوین، ئـەوەتا دەفەرموێت: *(خـودا پاداشـی شـایانی ئەوانـە دەداتـەوە کـە شـوکری دەکەن لەسەر نیعمەتی ئیسـلام و لەسـەری دەمێـنن و خـۆگر دەبـن)* آل عمران: ١٤٤.

هەروەها ئـەم دنیایـە دنیـای تاقیکردنەوەیـە، خـودا کەسانێك بـە دەوڵەمەندی و کەسانێکی دیکە بە هەژاری تاقیدەکاتەوە.

*خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: (زۆر چـاك بـزانن مـاڵ و دارایـی و ئەولاد و نەوەتـان هـۆی ئـاژاوە و نەگبـەتین بۆتـان و، خـودای گـەورە دەیـەوێت تاقیتـان بکاتـەوە. بەڕاسـتی پاداشـی گـەورە و گـران لای خودای گەورەیە.)* الأنفال: ٢٨

دواجار تاقیکردنەوە کۆتایی دێت، دەوڵەمەند دەوڵەمەندێتییەکەی و هەژار هەژارییەکەی لەدوای خۆی جێدەهێڵێت و دەڕوات.

دەرەنجام ئەو کەسەی لە ژیانی دوارۆژدا بە چوونە بەهەشت پاداشت دەدرێتەوە، ئەوە ئیدی براوەیە.

## بۆچی کەسانێك جوانن و کەسانێك ناشیرین؟

ئەم بابەتەش هاوشێوەی بابەتی دەوڵەمەندی و هەژارییە؛ سوپاسگوزاری بەرامبەر ئەوەی هەمانە و ئارامگری لەسەر ئەوەی نیمانە. واتە وەك دەوڵەمەندی و هەژاری، جوانی و ناشیرینیش پرسیارێکی تاقیکردنەوەکەیە.

جگە لەوە، خۆ ئێمەی بەندە مافمان نییە داوای بالآیەکی بەرزتر، قژێکی خاوتر، چاوێکی ڕەنگاوڕەنگتر و ڕووخسارێکی جوانتر بکەین.. بەلآم زۆر هۆکاری دیکە هەیە پاڵنەرمانە بۆ شوکرانەبژێری لەسەر ئەوەی وەك مرۆڤ بەدیهێنراوین.

# جوانی و ناشیرینیی ڕاستەقینە

بابەتی (جوانی و ناشیرینی)مان بەوردی لە پەرتووکی "بۆچی ناتوانم خودا ببینم"دا باس کرد، بۆیە پێشنیاز دەکەم دووبارە ئەو پەرتووکە بخوێنیتەوە، بەڵام پێم وایە وەبیرهێنانەوەی تەنیا کەمێك لەو بابەتە بەسە بۆ تێگەیشتنت:

جلوبەرگێکی جوان دەکرێت ئێمە جوان نیشانبدات، بەڵام بەس نییە بۆ ئەوەی بەڕاستی جوان بین. چونکە کاتێك جلەکەمان داکەند، ئیدی جوانییەکەش دادەماڵرێت لەبەرمان و لە دۆڵابەکەدا بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە، بۆیە ئەو جوانییەی پۆشاك پێمان دەدات، جوانییەکی کاتییە و هی ئێمە نییە. لەگەڵ لابردنی پۆشاکەکەدا جوانییەکەش نامێنێت.

بەهەمان شێوە؛ جلێکی ناشیرین دەکرێت ناشیرین نیشانمان بدات، بەڵام بەس نییە بۆ ئەوەی ئێمە بەڕاستی ناشیرین بین. هەر کە جلەکەمان گۆڕی، ئیدی هیچ ئاسەوارێکی ئەو ناشیرینییە نامێنێت.

جەستە بۆ مرۆڤ وەك پۆشاك وایە. خۆ گومانیش لەوەدا نییە کە ئەم پۆشاکە -جەستە-یە چ جوان بێت چ ناشیرین، ڕۆژێك دادێت کۆن دەبێت و پاشان لەژێر گڵدا دەڕزێت..

ئەوەی مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ: (ژیری و، ڕۆح و، ویژدان و، دڵ و، ئەندێشە و، هیوا و، بیروباوەڕ و، هەستی ترس و شادومانی و ئەو تایبەتمەندییانەیە کە لە ژێر ئەو جەستەیەدان).

هەروەها ئێمەی مرۆڤ چ جوان چ ناشیرینمان، ڕۆژێك دێت ماڵئاوایی لەم دنیایە دەکەین. ئەوەی لەگەڵماندا دەمێنێتەوە، چاکە و خراپەکانمانە، دادگەری و ستەمکاری، سەخاوەت و ڕەزیلی، ئیمان یان بێباوەڕی، دواجار پاداشت یاخود سزایە!

بەدەستەواژەیەکی دیکە، جوانی و ناشیرینییە ڕاستەقینەکان.. واتە ئەوکاتە دیاریدەدات کێ بەڕاستی جوانە و کێ ناشیرین.



## ئایا كەمئەندام، ستەمی لێكراوە؟

سەردەمانێك بەرگدروویەك هەبوو. بەرگدروویەكی تا بڵێیت دەستڕەنگین بوو! بەهۆی ناوازەیی ئەو جلكانەی دەیدروون، ناوبانگی بە هەموو لایەكدا بڵاو بووبووەوە.

ئەم بەرگدرووە، كەسێكی هەژاری بەكرێ گرتبوو تاكو ئەو پۆشاكانەی لەبەردا تاقیبكاتەوە كە دەیدروون.

جلوبەرگی یەك لەیەك قەشەنگتری لەسەر پیاوەی هەژار تاقیدەكردەوە و ورد دەبووەوە لە شێوازی وەستان و ڕێكوپێكییەكەی. بەپێی شارەزایی و ویستی خۆی دەیبڕی، كەموزیادی دەكرد و دەیدووری.

ڕۆژێکیان کابرای هەژار-ئیدی نازانم داخۆ ڕۆژانی نەبوونی و نەداریی بیرچووبووەوە یاخو چی- بە بەرگدرووە زاناکەی وت: "ئەرێ تۆ بۆچی ئەم جلەی بەر من دەبڕیت و قارسی دەکەیت! تەواو ڕێك بوو بە بەرم. ئەدی نابینیت چەند جوانە لەبەرمدا و لێم هاتووە؟".

بەرگدرووەکەش وەڵامی کابرای بەم شێوەیە دایەوە:

"تۆ بە چ مافێك وا بە من دەڵێیت! خۆ ئەو جلەی لەبەرتدایە هی تۆ نییە، بەڵکو من بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆم کردوومەتە بەرت. بڕین و قارسکردنەکەشی لەبەر چەند حیکمەتێکە کە تۆ نایزانیت. بۆیە کورت یان درێژی دەکەمەوە، چۆن ئارەزووم لێبێت وا دەیدروومو.. ئەی پێم ناڵێیت تۆ چیت بەسەرهاتووە. ئایا ڕۆژانی نەداریی خۆتت بیرچووەتەوە؟ لەبری ئەوەی شوکرانەبژێر بیت، ڕەخنە لە من دەگریت؟!".

چیرۆکەکەمان لێرەدا تەواو بوو..

ئێستا تۆ بیرێك لە جەستەی خۆت بکەرەوە!

کاتێك چاوت بە دنیا هەڵهێنا، بە بەرگێکی تایبەت بە مرۆڤەوە هاتیتە دنیاوە. زۆر باش دەزانیت، هیچ پارەیەکت نەدابوو لەبەرامبەر

وەرگرتنی ئەو جلەدا. هیچ بەرامبەرێکت نەدابوو لەپێناو ئەوەی لەبری مەڕێك –کە ئێستا لەنۆرەی سەربڕیندایە لە کوشتارگە– ببیتە مرۆڤێك و ئێستا ئەم پەرتووکە بخوێنیتەوە.

ئەو خوداوەندەی تۆی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، لەبری بەرد و دار کردووشیتی بە مرۆڤ. هەروەك چۆن نەیکردوویت بە شێلم یان دارهەرمێ.. یاخود کۆتر، یا کەروێشك، یا سیسرك.. چونکە سەردەمانێك نە تۆ هەبوویت نە ئەوان!

بۆ خودا هیچ جیاوازیەکی نەبوو کە تۆ وەك مرۆڤ یان هەریەك لەو گیاندارانەی دیکەی ناومانهێنان بەدیبهێنێت. تەنیا ئەوەندە نەبێت خودا ویستی لەسەر بوو تۆ وەك مرۆڤ بێیتەبوون. هەر بەو جۆرەش لەسەر جوانترین شێوە بەدییهێنایت.

کاتێك لەدایکبوویت لەبری پێستەی بەرخۆلەیەك، بە پێستی مرۆڤبوونەوە لەدایکبوویت. ئایا ئەگەر بۆت بلووایە، ئەو پۆشاکەت دادەکەند؟

بۆ نموونە لەبری ئەوەی مرۆڤێکی شەل بیت، حەزت دەکرد پشیلەیەکی چوار پێ بوویتایە و هەمیشە لەسەر چوار پێی ساغ و سەلیم ڕاوەستایتایە؟

ئەی ئەگەر چاوت نابینا بووایە؟

دەستەکانت گۆج بوونایە؟

گوێت کەڕ بووایە؟

مرۆڤایەتیی خۆت دەگۆڕییەوە؟

خودا یارمەتیی برا و خوشکانی خاوەن پێداویستیی تایبەتمان بدات، ئێمەی لەشساغ ناتوانین تەواو تێبگەین لە ئەستەمی و زەحمەتی ژیانی ڕۆژانەی ئەوان، بەڵام هەلومەرج هەرچۆنێك بێت، مرۆڤ دەست لە مرۆڤ بوونی خۆی هەڵناگرێت. ئەی تخوا وانییە؟

تکایە بە هەڵە لێم تێمەگە، من لێرەدا هەوڵنادەم مردنت نیشاندەم و ڕازیت بکەم بە سورێژە، یاخود خراپترینت نیشان بدەم و ڕازیت بکەم بە خراپ، بەڵکو هەوڵدەدەم ئەوەت تێبگەیەنم کە ئەوانەی پێمان دراون چەندە بەنرخ و بەبەهان. خۆ ئەگەر قایل نەبین بەوەی هەمانە، توانا و بازووی یاریزانە بەناوبانگەکانی گۆڕەپان و مەیدانیشمان پێبدرێت، دیسان هەر پێی دڵخۆش نابین.

خۆ لەڕاستیدا ئەگەر ئێمە بۆ هەتاهەتایە لەم دنیایەدا بژیاینایە، ئەوکات کەمئەندامی دەبووە کارەساتێکی مەزن لەسەر شانمان.

بەڵام ئاشکرایە ژیانی ئەم دنیایە ژیانێکی جاویدانی نییە، بەڵکو ژیانی جاویدانی لەو دنیا چاوەڕوانمانە. ڕۆژێک دێت هەموومان ماڵئاوایی لە جیهان دەکەین. خۆشەویستانمان جەستەی ساردوسڕ و بێگیانمان هاوشێوەی تۆوی درەخت لە گڵدا دەنێژن.

کاتێک ڕۆژی زیندووکردنەوەی مزگێنیدراو داهات، وەک ئەوەی خودای تاقانە بەڵێنیداوە، بەهاری هەمیشەیی تەمەن دێت و زیندوو دەبینەوە و دەگەڕێینەوە زێدی ئەسڵی خۆمان.

ئەو کەسانەی بۆ ماوەیەکی کاتی لێرە نابینان، لەوێ بۆ هەتاهەتایە دەبینن. ئەو کەسانەی لێرە بۆ ماوەیەک قاچیان تەواو نییە، لەوێ بۆ هەمیشە لە پیاسە و گەڕاندان.



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

*"ئەوانەی لەدنیادا لەش ساغ بوون، کاتێک لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینن چەندە پاداشت بە کەسانی بەلادار دەدرێت، ئاوات دەخوازن کە*

***ئەمانیش لە دنیادا پێستیان لێ بکرایەتەوە!"*** [1]

***هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: "خودای گەورە دەفەرموێت: کاتێك دوو چاو بەو شیرین و نازدارییە، لە بەندەی خۆمم سەندەوە و گیرۆدەی داوی کوێریم کرد و ئەویش مەردانە لەژێر باری تاقیکردنەوەی مندا ئارامی گرت و ددانی بەخۆیدا گرت و، بە بەشی من ڕازی بوو، ئەوە منیش هەقی بۆ دەکەمەوە و لەباتی ئەو دوو چاوە، لە قیامەتدا بەهەشتی دەدەمێ".*** [2]

---

١- سنن الترمذي: ٢٣٨٤

٢- صحيح البخاري: ٥٣٣٦

# مادەم خودا بۆخۆی دەزانێت من لە داهاتوودا چی دەکەم، ئیتر ئەوکات تاوانی من چییە؟

ئایا قەت بیرت کردووەتەوە لە جیاوازیی نێوان زانین و کردن؟

ئەگەر نەختێك بیر بکەینەوە دەبینین: لەناو خودی پرسیاری "مادەم خودا بۆخۆی دەزانێت من لە داهاتوودا چی دەکەم، ئیدی ئەوکات تاوانی من چییە؟"دا وەڵامەکە هەیە.

بەگوێرەی پرسیارەکە، بکەر منم، زاناش بە کردەوەکەی من خودایە! ئایا ئەگەر لەم نێوەندەدا کردەیەکی خراپ هەبێت هی کێیە؟

بێگومان کێ ئەنجامی بدات، هی ئەوە!

قەدەر بریتییە لە زانستی خودای تاقانە بـە ڕابـردوو و داهـاتوو و، خولقاندنی ڕووداوەکانی دنیا بـەگوێرەی زانسـتەکەی. بەوپێیـە خـودا زانایە بەوەی من و تۆ و هەموو مرۆڤەکانی دیکـە سـبەی چ دەکـەین. لەبەرئەوەش دەزانێت لە دەفتەری قەدەرماندا کردەوەکانی ڕابردوو و داهاتوومان تۆمارکراون.

باشـە هۆکـاری ئەنجامـدانی هەڵـەکانمان ئەوەیـە لـە قەدەرمانـدا نووسراوە؟ یاخود بەهۆی ئەوەی خودا بـە زانسـتی بێسـنووری خـۆی دەزانێت بەندەکەی چ هەڵەیەك دەکات بۆیە لە چارەی نووسیوە؟

بێگومان بژاردەی دووەم ڕاستە!

کردگار لەبەرئەوەی بە زانستی بێ سنووری خۆی دەزانێت ئێمە چ کارێك دەکەین، بۆیە نووسیویەتی.

کەواتە کاتێك هەڵە یان تاوانێك دەکـەین مافمـان نییـە بڵـێین: "چ بکـەم، خـودا وا لـە قـەدەرمی نووسـیوە. تـاوانی مـن چـییە؟" یـان "مادەم لە قەدەرمدا وا نووسراوە، ئیتر هیچم لەدەست دێت؟".

•••

هاوشێوەی پەرتووکەکانی دیکەی ئەم زنجیرەیە، کاتێك بابەتێکت بۆ شیدەکەمەوە، هـەوڵ دەدەم بـە نموونـەی پێویسـت تێتبگەیـەنم.

نموونــه وەك دووربینێــك وایــە و ڕێگــای دووری تێگەیشــتن نزیــك دەكاتەوە.

ئێستا چیرۆكێكی پەیوەندیدار بە بابەتەكەت بۆ باس دەكەم، بـەو شێوەیە ساناتر لە مەبەستەكەم تێدەگەیت:

## كابرای سەر گردەكە

دوو بـرادەر لەسـەر لووتكـەی تەپۆڵكەیـەك دانیشـتبوون، بـەدەم وتوێــژەوە تەماشــای دیمــەنی چــواردەوریان دەكــرد. لــە دامــێنی بەرزاییەكەدا هێڵێكی ئاسـنین هـەبوو، هـەموو چـەند كاتـژمێر جارێـك شەمەندەفەرێكی پێدا تێدەپەڕی.

دوای ماوەیەك دەنگـی زەنگـی شـەمەندەفەرێك هـات. نـا نـا، دوو شەمەندەفەر!

– شەمەندەفەرێك وا دێت.

– تۆ بڵێی لە كام لاوە بێت؟

– بڕوانە لەو لایەوە!

– بەڵام خۆ لەو لاشەوە وا دێت!

– نا كاكی خۆم، چۆن شتی وا دەبێت؟



– ده سه‌یركه !

– ئه‌ی هاوار، خۆ ئه‌وه‌تا له‌ هه‌ردوو لاوه‌ شه‌مه‌نده‌فه‌ر دێت. ئه‌ی ئێستا چ ڕووده‌دات؟

– له‌سه‌ددا نه‌وه‌د پێكداده‌كێشن.

– ئه‌رێ ده‌ بێده‌نگ به‌، ده‌م به‌ هاوار مه‌به‌ و قسه‌ی خراپ مه‌كه‌ !

– براله‌، تۆ بڵێی من حه‌ز بكه‌م پێكدابكێشن؟ به‌ڵام هه‌ركه‌سێك لێره‌وه‌ ته‌ماشا بكات و بیانبینێت، ده‌بینێت و ده‌زانێت ئه‌و دوو شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌ تۆزێكی دیكه‌ ده‌كێشن به‌یه‌كدا !

– دیسان تۆ وا مه‌ڵێ! له‌وانه‌یه‌ هیچ ڕووداوێك ڕوونه‌دات.

– پشت به خودا ڕوونادات! بەڵام تەماشا، زۆر لێك نزیكبوونەوە و نییەتی وەستانیان نییە. من دەڵێم دەكێشن بەیەكدا!... ئەوەتا پێكیانداكێشا!

– باش بوو واتكرد؟

– من چیم كردووە؟

– لەوكاتەوە دەڵێیت دەكێشن بەیەكدا، دەكێشن بەیەكدا! تاكو ئەوانیش پێكیاندادا!

– ئای خودایە، ئەوە تۆ ژیریت لەدەستداوە! یانی لەبەرئەوەی من زانیم و هەواڵمدا، دوو شەمەندەفەرەكە پێكیاندادا؟!

– بێگومان، ئەگەر تۆ نەتزانیایە و نەتوتایە، ئەوا دەعمیان نەدەكرد.

– من لە ژیانمدا شتی وا سەیرم نەبیستووە! شەمەندەفەرەكان پێكیاندادا و بەر لە ڕووداوەكە من زانیم. لەبەرئەوەی زانیم، هەواڵمدا. بەڵام خۆ لەبەر زانین و هەواڵدانی من، شەمەندەفەرەكان دەعمیان نەكرد. تەنیا لەبەرئەوەی پێشتر ڕەوتی دژبەیەكیان و ئەوەم دەبینی كە پاش كەمێكی دیكە پێكدادەكێشن، ڕووداوەكەم زانی و هەواڵمدا.

ئەگەرنا قەت دەبێت بەهۆی ئەوەی من وتوومە دەکێشن بەیەکدا، دوو شەمەندەفەری زەبەلاح ڕووبەڕوو بکێشن بەیەکدا؟

– ڕاست دەکەیت.

– وایە، بەڵام وابزانم تۆ نەختێك درەنگ لەمە تێگەیشتیت..

ئێستا وەرە ئەم چیرۆکە بهێنە و بەرجەستەی بکە و پرسیارەکەی خۆمان هەڵبسەنگێنە. پرسیارەکە چی بوو؟

"مادەم خودا بۆخۆی دەزانێت من لە داهاتوودا چی دەکەم، ئەی ئەوکات تاوانی من چییە؟"

با بڵێین من هەڵەیەکم کرد، بۆ نموونە درۆیەکم کرد.

ئەوکات دەکرێت بڵێیت: "لە قەدەرمدا درۆکردن نووسرابوو بۆیە درۆم کرد. واتە بێتاوانم"؟

ئەگەر بتوانم شتێکی وا بڵێم، ئەوا دەبێت ماف بدەمە کابرای سەر گردەکەش کە دەیوت: "لەبەرئەوەی تۆ زانیت و هەواڵی پێکداکێشانت دان، بۆیە دوو شەمەندەفەرەکە پێکیانداکێشا. تۆ ئەوانت پێکداکێشا".

بەڵێ لە قەدەری مندا درۆکردن نووسرابوو، بەڵام درۆکردنی من بەهۆی نووسراوەکەی ناو قەدەرەوە نەبوو، بەڵکو لەبەرئەوەی خودا

بە زانستی بێ سنووری فراوانی خۆی دەیزانی من درۆ دەکەم بۆیە لە قەدەرمدا نووسیی..

ئەی باشە، تاوانی من چییە؟

تاوانی من درۆکردنە! بۆیە ناتوانم تاوانەکەم بخەمە سەر قەدەرەکەم.

ئەمە ڕێك وەك کەسێك وایە کە دزیی کردبێت و لە دادگا بەم شێوەیە بەرگری لەخۆی بکات:

"چ بکەم جەنابی دادوەر! لە قەدەرمدا دزیکردن نووسراوە. ئەگەر لە قەدەرم نەنووسرایە، دزیم نەدەکرد. من قوربانیی دەستی قەدەرم".



# ئایا قەدەر زۆرمان لێناکات؟

ڕۆژێکیان لە مارکێتەکەی لای ماڵی خۆمان میوەم دەکڕی، لەو کاتەدا پرسیارێك دەربارەی قەدەر لام دروستبوو. ئیتر نازانم چۆن مرۆڤ لەکاتی هەرمێ کڕیندا پرسیار دەربارەی قەدەر لە مێشکیدا دروست دەبێت؟ پرسیارەکە بەم جۆرە لام گەڵاڵە بوو:

عەلاگەیەکم هێنا و لەسەر مێزی میوەکان دەستمکرد بە هەڵبژاردنی هەرمێ.

دانەدانە لە هەرمێکان ورددەبوومەوە، ئەگەر فلیقاوییەکی بچووکم پێوە ببینیایە دامدەنایەوە و نەمدەخستە ناو عەلاگەکەوە. سێ دانە هەرمێی ناوازەم بەرچاوکەوت.

بەڵام تەنیا دوو دانەم مابوو بەشی پێویستی خۆم پڕبکەمەوە. ڕێك لەوکاتەی دەستم بۆ سێیەم دانە درێژکرد، پرسیارەکە هات بە مێشکمدا. دەنگێك لە ناخمەوە وتی:"لە قەدەرتدا کڕینی کام هەرمێیانە هەیە، هەر ئەوانە هەڵدەبژێریت. ئەگەر لە قەدەرتدا هەرمێیەکی گەنیو هەبێت، بێ هەڵبژاردنی ئەو هەرمێیە لێرە ناچیتە دەرەوە! کەوایە چ مانایەکی هەیە من دانەدانە تەماشای هەرمێکان دەکەم و هەڵیاندەبژێرم. چاوت داخە و هەرچییەك هات بە دەستدا بیهاوە ناو عەلاگەکەتەوە!"

ئیدی سەرم لێتێکچوو، تەماشای هەرمێکانی دەستم دەکرد: یانی من بە هەوانتە لەوکاتەوە هەرمێ هەڵدەبژێرم؟

چەند خولەکێك لەبەردەم مێزی میوەکاندا وەستام. دواتر بە خۆمم وت:

لەسەر ئەم مێزە هەم هەرمێی باش هەیە هەم گەنیو.. دەکرێت من هەرمێی ساغ یان هەرمێی گەنیو بخەمە نێو عەلاگەکەمەوە.. هەڵبژاردنی هەرمێکان ئەرکی سەر شانی منە.

مرۆڤ بەجۆرێك ئافەرێنراوە کە توانای هەڵبژاردن و لێکجوداکردنەوەی هەرمێکانی هەیە.



مێشکم پێدراوە بۆ بیرکردنـەوە و چـاو بـۆ بیـنین، بۆیـە بێگومـان هـەرمێکان هەڵدەبـژێرم و بـەوجۆرە دەیکـڕم. واتـە بـاش و خراپـی لێکجیادەکەمەوە.

هیچ کەسێك لەخۆڕا نەهاتووە زۆرم لێبکات هەرمێی گەنیو بکڕم.

بۆیە کاتێك هەرمێی گەنیوم هەڵبژارد مافی ئـەوەم نییـە بڵـێم: "لـە قەدەرمدا کڕینی هەرمێی گەنیو هەبوو. قەدەر منی ناچـار بـە کـڕینی هەرمێی گەنیو کرد".

ئەگەر وابڵێم ئەوکات ماڵەوە پێم دەڵێن: "ئـەی چـاوت نەیـدەبینی وا ئـەم خراپانـەت کڕیـوە؟ خـودا چـاو و ئـەقڵی پێـداویت. توانـای جوداکردنەوەی باش و خراپ، سـاغ و گـەنیوی پێـداویت. کەچـی تـۆ

عەلاگەیەك هەرمێی گەنیوت پڕکردووە و لەگەڵ خۆت هێناوتەوە. ئەی هاوار! ئەمە چ کڕینێکی خراپە!".

کەواتە؛ لەکاتێکدا مێزەکەی بەردەمم پڕ بوو لە میوەی تازە و ساغ و من چووم گەنیوەکانم هەڵبژارد، ئیدی من بەرپرسیارم و ناتوانم قەدەر تۆمەتبار بکەم.

## باش و خراپی هەموو شتێك هەر قەدەرە

ئەسڵی بابەتەکە ئەمەیە؛ ئەگەرچی هەرمێکان دانە دانە هەڵبژێریت یاخود هەروا بێ سەیرکردن عەلاگەکەت پڕبکەیت، دیسان هیچ هەرمێییەك نییە تۆ بیکڕیت و لە قەدەردا نەبێت، چونکە خودا بە زانستی بێ سنوور و فراوانی خۆی دەزانێت من هەرمێی ساغ دەکڕم یاخود گەنیو. ئەمەش لە قەدەرەکەمدا نووسراوە.

زانینی خودا و نووسینی ئەو قەدەرە بۆم، بەهیچ جۆرێك من ناچار یان سنووردار ناکات. واتە بە ویستی خۆمە، بمەوێت هەرمێی باش دەکڕم، بمەوێت هەرمێی خراپ. تەنیا دوای ئەوەی هەڵمبژارد و کڕیم، دەتوانم بڵێم: "ئای، کەوایە کڕینی ئەم هەرمێیانە لە قەدەرمدا نووسراوە".

بەڵێ وایە...

هەموو کەسێکی خاوەن ژیریی کاتێك دەچێتە بازاڕ و سێو، یا هەرمێ، یان ترێی جوان و گەییو دەکڕێت، زۆر باش لەوە تێدەگات قەدەر ناچاری نەکردووە بە هەڵبژاردنی ئەوانەی کڕیونی؛ چونکە ژیریی و دڵ و ویژدانمان پێمان دەڵێت چ باشە و چ خراپ، کامە ساغە و کامە گەنیو.

قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕێنموونیمان دەکەن. گەر بمانەوێت گوێ لەوان دەگرین، گەر نەمانەوێت فەرامۆشیان دەکەین، واتە بژاردەکە لەدەستی ئێمەی مرۆڤدایە و هەر خۆشمان لێی بەرپرسیارین...



# ئایا باشتر نەبوو خودا هیچ خراپەیەکی بەدینەهێنایە؟

(ئێمە بە خراپە و بە چاکە تاقیتان دەکەینەوە بۆ دەرکەوتنی هەڵوێستتان لە خۆشی و لە ناخۆشیدا و سەرەنجامیش دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خۆمان و هەرکەس پاداشی شایانی خۆی وەردەگرێت) الأنبياء: ٣٥.

- "گومانمان نییە کە خودای تـاك و تـەنها هەرچـی شـتی بـاش و جـوان و بەکەڵکـە بەدیـدەهێنێت. بەوپێیـەی لـەم گەردوونـەدا بەدیهێنەرێکی دیکە نییـە، کەواتـە دەبێـت شـتە ناشـیرین و خـراپ و بێفڕەکانیش هەر زاتی ئەو بەدیانبهێنێت! باشە کەواتـە هۆکارەکـەی چییە؟ ئەگـەر ئـەو بەدینەهێنایـە، مـرۆڤیش شـوێنی نەدەکـەوت و تووشی هەڵە نەدەبوو. ئەی وانییە؟"

- با وەڵامی پرسیارەکەت بە پرسیارێك بدەمەوە:

چەند باش دەبوو ئەگەر لە تاقیکردنەوەدا مامۆستا تەنیا وەڵامی ڕاست بدات تاکو تۆ هەڵیبژێریت و نمرەی تەواو بەدەستبهێنیت. ئەدی وا نییە؟

ئەوکات تەمبەڵ و زیرەك هەموو وەك یەك هەمان نمرەیان وەردەگرت! بەڵێ هەمووتان نمرەی تەواوتان وەردەگرت، بەڵام ئەوکاتە ئیدی ئەمە ناوی تاقیکردنەوە نەدەبوو.

لەم بارەدا وەك چۆن شەونخونی و سەعیی زۆر هیچ ئەنجامێکی جیاوازی نەدەبوو، هەروەها تەمبەڵیکردن و پاڵدانەوە و نەخوێندن ئەنجامێکی خراپی نەدەبوو. لێرەدا قوتابیانی سەعیکەر مافخوراو و، تەمبەڵەکان بە هەمان ئاست سوودمەند دەبوون!

ژیانی دنیا بۆ مرۆڤ وەك تاقیکردنەوەیەك وایە. لێرە ڕاست و چەوت، باش و خراپ، بەسوود و زیانبەخش، حەڵاڵ و حەرام... هەموو پێکەوەن.

*(ئێمە بە خراپە و بە چاکە تاقیتان دەکەینەوە).*

تاکو کۆتایی تاقیکردنەوەکە دەستوەرنادرێتە ڕێگەی هیچ کەسێکەوە، بەڵام ئەم تاقیکردنەوەیە لایەنێکی زۆر جیاوازی لەوانەی قوتابخانە هەیە:

لێــره وەڵامــی ڕاســت و وەڵامــی چــەوت دیــاریکراون و ڕوون و ئاشکران.

*خودای گەورە دەفەرموێت: (بەڕاستی ئـەم فـەرمانی سـەربڕینی ئیسماعیلە کە خودا دابووی بە ئیبراهیم، تاقیکردنەوەیەکی مەزن بوو بـۆ دەرکـەوتنی فەرمانبـەرداری کردنــی لــە فەرمانــەکانی خــودا)*

الصافات: ١٠٦.

واتە سوودبەخش و زیانبەخش، بـاش و خـراپ، حـەڵاڵ و حـەرام، حەق و ناحـەق، کۆمەڵـە شـتانێکن کـە هـەر مرۆڤێـك –بـە ئەنـدازەی ئاسانیی جوداکردنەوەی میوەی ساغ و گەنیو لـە یـەکتر– دەتوانێـت لێکیان جیابکاتەوە.

بۆ نموونە هەموو کەسێك دەزانێت خواردنەوەی مەی هەم شتێکی خـراپ و هـەم بـۆ تەندروسـتیی مـرۆڤ زیانبەخشـە، بـەڵام سـەرەڕای ڕوونیــی ئەمــە، کەســانێك مــەی دەخۆنــەوە و کەســانێکی دیکــە نەخواردنەوەی هەڵدەبژێرن.

هەموو مرۆڤێك دەزانێت بەرتیل وەرگرتن یان بەرتیل دان ستەمکاریی و حەرامە، کەچی هەندێك کەس دەیدەن و، هەندێکیش بێ ئەوەی شەرم بکەن وەریدەگرن. کەسێکیش نییە بڵێت: "من نەمدەزانی بەرتیل قەدەغەیە".

تا ئێستا چ دزێك وتوویەتی: "من نەمدەزانی دزی کارێکی خراپە، ئەگینا چۆن دەمکرد"؟

چ درۆزنێك دەتوانێت بۆ درۆکانی، چ غەیبەتکەرێت بۆ غەیبەتەکانی، چ حەرامخۆرێك بۆ حەرامخۆرییەکانی دەتوانێت پاساو بهێنێتەوە و بڵێت: کارێکی باشە؟

بەڵکو هەموویان وێڕای ئەوەی دەزانن خراپ، زیانبەخش، گوناه، حەرام و قەدەغەیە؛ کەچی هەر دەیکەن.

بەڵێ، دنیا جێگای تاقیکردنەوەیەکی وایە. زۆرینەی خەڵك لەگەڵ ئەوەی وەڵامە ڕاست و چەوتەکان دەزانن، کەچی نمرەی نزم دەهێنن و دەرناچن.

جیاوازییەکی باشی دیکەی ئەم تاقیکردنەوەیە ئەوەیە: وەڵامی چەوت وەڵامی ڕاست نابات، بەڵکو بەپێچەوانەوە، زۆرجار وەڵامی ڕاستی وا هەیە چەند وەڵامێکی چەوت دەسڕێتەوە. ئەوەتا لەبەرامبەر

چاکەیەکی گچکەدا، خودای گەورە پاداشتی گەورەی بەندەکانی دەداتەوە.

بە پێی تاقیکردنەوەکە، ئەوانەی تەنیا واز لە خراپەکاری دەهێنن؛ بەرامبەر وازهێنانیان پاداشت دەدرێنەوە. ئەوانەشی تەواو پەشیمان دەبنەوە و جارێکی دیکە ناگەڕێنەوە سەر خراپەکاری؛ هەڵەکانیان دەسڕدرێنەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمانە هێشتا کۆمەڵێك دەرناچن!

ئەوانەشی دەردەچن؛ بەڕاستی سەرکەوتنەکەیان سەرکەوتنێکی ئێجگار مەزنە.

لەبەرامبەر ئەو چاکانەی کردوویانە، چاکەی زۆر گەورەتر وەردەگرنەوە.

*خودای گەورە دەفەرمووێت: (هەرکەسیش چاکەیەك بکات پاداشتی چاکەکەی بۆ زیاد دەکەین. خودا گوناه بەخش و پاداشت دەرەوەیە)* الشوری: ٢٣.



## بەدیهێنانی (خراپ) خراپ نییە، هەڵبژاردنی (خراپ) خراپە

لە ژیانی دنیادا وەک چۆن دەتوانین شتی باش و جوان داوابکەین، بەهەمان شێوە دەشتوانین شتی ناشیرین و خراپ داوابکەین. هەروەک چۆن مافی ئەوەمان هەیە بژاردەمان بە ئاراستەی شتانی سوودبەخش بەکاربهێنین، هەرواش مافمان هەیە شتی زیانبەخشی پێهەڵبژێرین.

چۆن چاکەی چاککاریی و سوودی سوودبەخش دەبینین، ئاواش خراپەی خراپکاری و زیانی زیانبەخش دەبینین.

بێگومـــان بەدیهێنـــەری چـــاکە و خراپـــە و ســـوودبەخش و زیانبەخشیش هەر خودای تاقانەیە؛ چونکە جگە لە زاتی ئەو بەدیهێنەری دیکە لە گەردووندا نییە، بەڵام خۆ بەدیهێنانی خراپە خراپ نییە، بەڵکو هەڵبژاردنەکەی خراپە.

بۆ نموونە خودا توانای ئاخافتن لە مرۆڤدا بەدیدەهێنێت. ئەگەر بەدیهێنـەری تاقانە دەم، زمـان، ددانـەکان، دەنگەژێیـەکانی وەك ئەوەی ئێستا هەیە بەدینەهێنایە، ئەگەر گەردەکانی هەوای بەجۆرێك کە گونجاوبێت بۆ گواستنەوەی شەپۆلەکانی دەنگ بەدینەهێنایە، ئەوکات نەماندەتوانی بدوێین.

ئەگەرچی ڕاست بدوێین یاخود درۆ، بەدیهێنـەری ئاخاوتن هەر خودایە. لێرەدا بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە نەك بەدیهێنانی توانای قسەکردن، بەڵکو هەڵبژاردنی درۆوتن خراپە!

ڕاستگۆیی و درۆگۆیی هەر خودا بەدییهێناون، بەڵام زاتی پەروەردگار خۆشی لە درۆ نایەت. بەتایبەت درۆیەك کە بوختانیش بێت یاخود خەڵکی بکات بەگژ یەکتردا، ئەوە تەواو نەفرەت لێکراوە!

بەڵام لەم دنیایەدا مرۆڤەکان خۆیان قسەکانیان هەڵدەبژێرن و سەربەستن لەوەی چی دەڵێن، خودای گەورەش لەبەر ئەوەی زانایە



بە هـەموو شتێك، دەزانێـت هـەر مرۆڤێك چـی دەڵێت و ئـەوەی لـە دەفتەری قەدەرەکەیدا بۆ نووسیوە.

بەهەمان شێوە بەدیهێنـەری کرداری بینینـیش خودایـە. بینـینی گوڵە بەهارییەك بەوپەڕی ناسکی و جوانییەوە خـودا بەدیـدەهێنێت، هەروەك چۆن بەدزییەوە بینینی نامەی نهێنیی کەسێکی دیکەش –کە کارێکی خراپە– هەر خودا بەدیدەهێنێت.

یەکەمیان باشە و ئەوی دی خـراپ، بـەڵام لێـرەدا خراپەکارییەکە بەدیهێنانی بینین نییە، بـەڵکو تەماشـاکردنی نامەیەکە کـە نـەدەبوو تەماشای بکەین.

نموونەیەکی دیکە:

خودا ئاگری بەدیهێناوە. ئاگر، یەکێکە لەو شتانەی مرۆڤ لەسەر ڕووی زەوی زۆرترین سوودی لێدەبینێت، بەڵام لەهەمان کاتدا لەڕێزی پێشەوەی ئەو شتانەشەوە دێت کە زیانی گەلێك مەزنی لێدەکەوێتەوە.

پرسیار لێرەدا ئەوەیە، ئایا بەدیهێنانی ئاگر باشە یان خراپ؟

بێگومان باشە، خراپ ئەوە نییە ئاگر بەدیهاتووە، بەڵکو خراپ ئەوەیە بەو ئاگرەی خودا بەدییهێناوە، دەست و پێی خۆت بسوتێنیت، دارستان و گژوگیا بسوتێنیت، موڵك و ماڵی خەڵکی بسوتێنیت. بەکورتی مەبەستمان: خراپ بەکارهێنانی ئاگرە.

واتە ئێمەی مرۆڤ ئەگەر چاکەمان بووێت، خودا چاکەمان بۆ بەدیدەهێنێت. ئەگەریش خراپەمان بووێت خودا خراپەمان بۆ بەدیدەهێنێت، بەڵام بەدیهێنانی (خراپە) خراپ نییە، بەڵکو ویستنی (خراپە) و هەڵبژاردنی لەکاتێکدا چاکە لە تەنیشتییەوە ئامادەیە خراپە..

# ئێمە دەخوازین و خودا بەدیدەهێنێت!

ڕۆژێك لە ڕۆژان منداڵێك بە باوكی وت:

– بابە گیان، من لەباوەش بكە و بمبە بۆسەر لووتكەی ئەو گردەی ئەوبەر!

باوكی لە وەڵامدا وتی:

– ڕۆڵە گیان، هەوای ئەوێ ئێستا ساردە، سەرمات دەبێت.

– نەخێر بابە، من هەر دەمەوێت بچمە سەر لووتكەكە.

– ئاخر ڕۆڵە گیان ئەوێ زۆر بەرزە. ئەگەر بكەویتە خوارەوە چی؟

منداڵەكە لەگەڵ پێداگریدا ئەمجار دەستیكرد بە نوزەنوز و هاواركردن وتی:

– نەخێررر، من دە–مە–وێت بچمە سەر لووتكەكە و تەواو.

پیاوەكە بە دڵێكی ناڕەزا منداڵەی كردە باوەش و بردییە سەر لووتكەی بەرزاییەكە.

لەڕاستیدا ئەوێ زۆر ساردبوو، وشکەبایەکی تەزێنەریش هەڵیکردبوو، نمەنمە بارانیش دەباری.

منداڵەکە دەستیکرد بە گلەیی و گازندە:

– سەرمامە، زۆر سەرمامە. خۆزگە منت نەهێنایە بۆ ئێرە. بۆچی منت هێنا بۆ ئەم شوێنە ساردە؟

باوکیشی وتی:

– ئەوە نەبوو خۆت ویستت!

منداڵەکەی دەستی بە گریان کرد:

– ئێرە هەم ساردە و هەم ترسناک. باشە شوێنێکی دیکە نەبوو منی بۆ بەری ئێرە نەبێت؟

لەبەرامبەر ئەمەدا باوکی تووڕە بوو:

– تۆ گوێت لە من نەگرت، ئاگادارییەکەمت فەرامۆشکرد. هاوارت دەکرد و دەتوت ئیلا دەبێت بمبەیتە سەر لووتکەکە. منیش لەسەر ویستی خۆت تۆم هێنا. تۆ بڕوانە، چیم وتبێت وا دەرچوو. سەرمات بوو، ترسایت، لەخۆڕا خۆت خستە مەترسییەوە. ئێستاش بێ ئەوەی شەرم بکەیت هاتوویت دەڵێیت بۆچی منت هێناوە بۆ ئێرە؟

ئەمە چیرۆکێك بوو. ئێستا وەرە با پێکەوە ئەم چیرۆکە بکەینە دووربینێك ئەسڵی بابەتەکەی پێ ببینین.

حاڵی ئێمە لەم دنیایەدا لەحاڵی منداڵەکە دەچێت. (ئێمە چاك یاخود خراپ داوا دەکەین و خودای کردگاریش بەدیدەهێنێت).

ئەگەر ئەو شتەی داوای دەکەین، خراپە و تاوانکاری بێت، ئەوکات خۆمان تاوانبارین، نە بۆمان هەیە گازندە بکەین و بڵێین: "بۆچی خودا بەدییهێنا؟"، نە دەتوانین قەدەر تۆمەتبار بکەین...

# ئەگەر لە دەفتەری قەدەرمدا "نمرەی نزم" نووسرابێت، ئیدی بۆچی بخوێنم و کۆشش بکەم؟

لـە ئامـادەیی مامۆسـتایەکی جیـاواز و سـەیرمان هـەبوو. پـاش تێپەڕبوونی دوو مـانگ بەسـەر کرانـەوەی قوتابخانـە ئـیتر قوتابیـانی بەباشی ناسی و شارەزایان بوو... دواتر وای لێهاتبوو لە پۆلدا هێمای بۆ چەند قوتابییێك دەکرد و دەیوت:

"تۆ، تۆ و تۆ. ئێوە لـە تاقیکردنەوەکـەی سبەینێدا لـەکۆی (١٠) نمرە (٤) دەهێنن. پەیمانتان پێدەدەم ئەگەر (٤) نمرەتان هێنا، ئەوا بۆتان دەکەم بە (٥)".

زۆرجار پێچەوانەکەی ئەمەش ڕوویدەدا:

"تۆ! نا نا، تۆ.. تۆ. پێم وایە لە تاقیکردنەوەکەدا لە (٨) نمرە کەمتر ناهێنیت..".

سەرەتا کاتێک گوێمان لەم قسانەی مامۆستاکە دەبوو، تەنیا پێدەکەنین و گوێمان پێنەدەدا، بەڵام دواتر کە بینیمان ئەوانەی پێی وتوون: "سێ نمرە یاخود چوار دەهێنن!" هەموویان کەمیان دەهێنا و دەرنەدەچوون، ئەوانەشی پێی وتوون: "لە هەشت یان نۆ نمرە کەمتر ناهێنن بگرە لەوانەیە دە نمرەی تەواو بهێنن!" هەموویان نمرەی تەواو بەرزیان دەهێنا؛ ئیدی ئێمەش قسەکانی ئەومان بە هەند وەردەگرت.

ڕۆژێکیان لێمان پرسی، ئایا چۆن دەتوانێت وا پێشبینییەك بکات. لە وەڵامدا وتی: "ئەمە نە غەیبزانییە و نە هیچ. چەندین ساڵە مامۆستام، ئەوەندە لەم کارەم شارەزا بووم کە پێشبینی بکەم..".

ئەو قوتابیانەی نمرەی بەرزیان دەهێنا خۆشحاڵ دەبوون بە دۆخەکە و بێدەنگ بوون، بەڵام ئەوانەی پێی وتبوون: "سێ یان چوار نمرە دەهێنیت" و هەر ئەوەندەشیان دەهێنا، کاتێک ئەنجامی تاقیکردنەوەکەیان وەردەگرتەوە کێچ دەکەوتە کەوڵیان.



ئەوان توورە دەبوون و بێزاریی خۆیان دەردەبڕی: "کاکی خۆم، ئەم کابرایە دەم و زمانی زۆر کاریگەرە. دەڵێت سێ نمرە دەهێنیت، سێ دەهێنم. دەڵێت چوار نمرە دەهێنیت، چوار دەهێنم. ئێ دە با بڵێت حەوت یان هەشت نمرە دەهێنیت، ئەوکات بەڵکو هەشت بهێنم...".

مامۆستا دەیزانی دوای تاقیکردنەوەکە ئەوانەی نمرەی نزمیان هێناوە دەستدەکەن بە گلەیی و گازندە، بۆیە بە پێنووسی سوور هێڵی دەهێنا بەژێر هەڵەکانیاندا و بۆی دیاری دەکردن تاکو قڕە و بڕەیان نەهێڵێت و بەچاوی خۆیان ببینن، کاتێک قوتابییەکان

بەڕوونی هەڵـەکانی خۆیـان دەبیـنن، ئیـدی دەنگیـان لێـوە نایـەت و قوبووڵی دەکەن.

ئێستا پرسیارێکت لێدەکەم، بەڵام باش بیربکەرەوە و پاشان وەڵام بدەوە:

ئایا بەهۆی ئەوەی مامۆستا پێش تاقیکردنەوە بە هەندێکیانی دەوت: "سێ نمرە یان چوار وەردەگریت، هەرگیز پێنج ناهێنیت"، ئەوان نمرەی نزمیان دەهێنا و دەرنەدەچوون؟

بێگومان نەخێر! پێشبینیی مامۆستا بەئەزموونەکە هەرگیز هۆکاری نمرە نزمەکانی قوتابیان نەبوو، بەڵکو هۆکارەکەی تەمبەڵی و سەعی نەکردنی خۆیان بوو.

مامۆستا دەیزانی ئەوان سەعی ناکەن، بۆیە پێشبینیی دەکرد و دەیزانی لە تاقیکردنەوەکەشدا نمرەی نزم وەردەگرن و دەرناچن. ئەو تەنیا ئەمەی دەهێنایە زمان و هیچی تر!

کەواتە کۆتایی ساڵ کاتێك قوتابیان کارتەکانیان وەردەگرن و دەبینن ئەنجامەکانیان خراپە، دەتوانن گازندە بکەن و بڵێن: "خەتای ئێمە چییە، خۆ مامۆستا هەر زوو دەیزانی و پێی وتین دەرناچین. ئێمەش وتمان کە مادەم دەرناچین، ئیدی بۆ بخوێنن. بۆیە پاڵمان لێدایەوە و خۆمان ماندوو نەکرد"؟

بێگومان ماف وا گازندەیەکیان نییە.

ئەگەر لە مانای ئەم چیرۆکە باش تێگەیشتبێتیت، ئەوا بێگومان وەڵامی پرسیارەکەت دەستکەوتووە، بەڵام دیسان پێم باشە زیاتر گوێم بۆ بگریت تاکو وەڵامەکەت بە تەواوی لا ڕوون ببێتەوە.

## سەعی کردن یاخود پاڵلێدانەوە..

با بڵێین سبەینێ تاقیکردنەوەی بیرکاریت هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی وابیردەکەیتەوە کە:"هەرچۆنێك بێت خۆ هەر دەرناچم"، بۆیە بڕیاردەدەیت پاڵی لێبدەیتەوە و سەعی نەکەیت.

واتە دەڵێیت: "خۆ لە قەدەرم نووسراوە نمرەی باش دەهێنم یاخود خراپ. ئەگەر قسمەتم لە نمرەی بەرز بێت ئەوا کەم ناهێنم،

ئەگـەریش قسـمەتم لـە نمرەی نـزم بێـت ئـەوا زۆر نـاهێنم. کەوایـە سەعیکردن یان نەکردن چ سوودێکی هەیە! ئیدی بۆچی لەخۆڕا خۆم ماندوو بکەم".

بەڵام، خۆ نازانیت لە تاقیکردنەوەکەی سبەینێدا چەند دەهێنیت!

بۆیە لە دۆخێکی وادا دوو ڕێگا لەبەردەمتدا هەیە:

یەکەمیان:

دەڵێیت: "ئەگەر لە قەدەرمدا وەرگرتنی نمرەی بەرز هـەبێت ئـەوا نمرەی بەرز دەهێنم، نمرەی نزمیش هەبێت نمـرەی نـزم دەهێـنم" و هەموو ڕۆژەکە بە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن بەسەردەبەیت.

خۆ ئەگەر کەسێك ئەم ڕێگایە هەڵبژێرێت، ئیدی هـەر پێویسـتیش ناکات سبەینێ بەیانی لەخەوهەڵسێت و بچێت بۆ قوتابخانـە، چـونکە گەر لـە قەدەرتـدا چـوون بـۆ قوتابخانـە نووسـرابێت، بـەجۆرێك هـەر دەچیت، ئەی وا نییە؟ بۆیە کاتێـك خـەوتیت، پێویسـت ناکـات ئـیللا لەخەو هەڵسیت. هەروەها ئەگـەر لـە قەدەرتـدا چـوون بـۆ قوتابخانـە نەنووسـرابێت، ئیـدی چ پێویسـت دەکـات خـۆت لـەو خـەوە شـیرینە بکەیت!



ئای، ئەوە دایکت بانگیکردیت بۆ نانی بەیانی؟

گوێی مەدەرێ! چ پێویست دەکات زەحمەت بکێشیت و بڕۆیت بۆ مەتبەخ؟ ئەگەر لە قەدەرتدا تێربوون هەبێت، ئەوا بەجۆرێك هەر تێر دەبیت. ئەگەریش لە قەدەرتدا برسیبوون هەبێت، ئەوا هەرچەندە بخۆیت هەر تێرنابیت.

بۆیە، تکایە بنوو و هەڵمەستە!

لەڕاستیدا لەسەر ئەم ڕەوتە زیاتر وردبینەوە، دەگەینە ئەو بڕوایەی تەنانەت چوون بۆ تاقیکردنەوەش مانایەکی نییە، چونکە ئەوانەی نمرەی نزم بەدەستدەهێنن دەڵێن: "قەدەر خواستی کە نمرەی نزم بهێنم"، بۆیە بەرپرسیاریەتی لەئەستۆ ناگرن. واتە کاتێك ئێوارە دەگەڕێنەوەماڵەوە باوکیان ناڵێت: "ڕۆڵەکەم، بڵێ بزانە چەند نمرەت بەدەستهێنا لە تاقیکردنەوەی بیرکاری؟" بەڵکو دەپرسن:




"ڕۆڵەکەم، بڵێ بزانە بۆت دەرکەوت لە قەدەرتدا چەند نمرە نووسراوە؟".

ئێ ئەوکات بێگومان وەڵامەکەشی بەم شێوەیە دەبێت: "تومەس لە قەدەرمدا دەرنەچوون هەبوو. من تاوانێکم نییە، قەدەر وای خواست".

لەڕاستیدا دۆخی ئەوانەی نمرەی بەرزیان بەدەستهێناوە گەلێك تاڵ و مایەی نیگەرانییە، چونکە کەس پێیان ناڵێت: "هەربژیت! شەونخونیت کرد و ئەوەتا ئەنجامەکەییت وەرگرت"، بەڵکو پێیان دەڵێت: "لە قەدەرتدا نمرەی بەرز هەبوو ئەوەتا وەرتگرت. خۆ

ئەگینا سەعیکردن و شەونخونییەکەت هیچ کاریگەرییەکی نییە. بۆیە لەخۆڕا چاوەڕوانی هیچ دیارییەك مەبە.."!

بەم جۆرە، هیچ جیاوازییەك لەنێوان زیرەك و تەمبەڵدا نەدەما. بۆمان دەرنەدەکەوت کێ دەخوێنێت و هەوڵدەدات، کێ پاڵدەداتەوە و وانەکانی پشتگوێ دەخات..

ئەوکات مامۆستایانیش وازیاندەهێنا لە هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی قوتابییەکانیان! ئەدی ئەوە نییە هیچ قوتابییێك جگە لەوەی لە قەدەریدا نووسراوە، نمرەیەکی دیکە بەدەستناهێنێت!

بینیت هەموو شتێك چۆن تێکچوو بەسەریەکدا؟ ئایا دەتویست ژیانێکی بەم جۆرەت هەبێت؟

لەکاتێکدا لەم جیهانەدا تەنانەت کرمۆکەی سەر تەختەیەکی شێداری ڕزیو لەپێناو مانەوەی لەژیاندا بەوپەڕی توانایەوە کاردەکات و هەوڵدەدات، ئەگەر تۆ بێیت پاڵی لێ بدەیتەوە و بڵێیت: "با چاوەڕێبین و بزانین قەدەر چی دەکات بە نسیبمان؟" ئەوا زۆر زیاتر لەوەی بیری لێدەکەیتەوە دەبێت لەچاوەڕوانیدا بیت، چونکە هیچ دەرەنجامێکی نییە!

خۆ ئەگەر تەنانەت بتزانیبایە و دڵنیا بوویتایە لەوەی قەدەر لە تاقیکردنەوەکەی سبەینێدا چ نمرەیەکی بۆ دیاریکردوویت، ئەوا دەکرا نەختێك مافت پێبدەم، بەڵام کاتێك بابەتەکە تەنیا لەچوارچێوەی ئەگەردا بێت و بڵێیت: "ئەی ئەگەر وابوو، ئەی ئەگەر وانەبوو"، ئەوا ناگەیتە هیچ ئەنجامێك.

تۆ نازانیت لە تاقیکردنەوەکەی سبەینێدا چ نمرەیەك وەردەگریت، نەزانینەکەشت شتێکی ئاساییە، چونکە پێویستە چاوەڕێی سبەینێ بکەیت تاکو بزانیت چ ڕوودەدات، بەڵام ئەو بەدیهێنەرەی کە خۆی "کات"ی بەدیهێناوە و بەرلە بەدیهاتنی "کات"یش هەر هەبووە، وەك ئێمەی مرۆڤ پێویستی بەوە نییە چاوەڕوانی تێپەڕینی کات بکات تاکو بزانێت سبەینێ چ ڕوودەدات!

بۆیە زاتی ئەو دەزانێت تۆ لە تاقیکردنەوەکەی سبەینێدا چ نمرەیەك وەردەگریت و ئەم زانیارییەش لە دەفتەری قەدەرتدا تۆماردەکات، بەڵام ئەو زانیارییەی کە نووسراوە تۆ ناچار ناکات ئەو نمرەیە بەدەستبهێنیت، بەڵکو ئەو نمرەیەیە کە خۆت وەریدەگریت.

واتە زانیارییەکی هەواڵییە!

واتە تۆ خۆت لە تاقیکردنەوەکەی سبەینێدا توانای بەدەستهێنانی چەند نمرەت هەبێت و چەند وەربگریت، ئەوە لە قەدەرەکەتدا نووسراوە.

ئێستا بیرێك بکەوە لەو مامۆستایەی پێشبینیی نمرەکەی کرد بۆ قوتابییەکانی.

بیرتە؟ ئەوکات مافت نەدا بەو قوتابییانەی وتیان: "بەهۆی ئەوەی مامۆستا پێی وتین دەرناچن، بۆیە نەمانخوێند و پاڵمانلێدایەوە".

لێرەشدا بابەتەکە بەهەمان شێوەیە. لەوێ چۆن پێشبینیکردن و هەواڵدانی مامۆستاکە هۆکاری دەرنەچوونی قوتابیەکان نەبووە، لێرەش بەهەمان شێوە بەهۆی ئەوەی لە قەدەرتدا نمرەی نزم نووسراوە، نمرەی نزم وەرناگریت.

وەك سەرەتاش وتم: تۆ زانانیت بە قەدەری خۆت. سبەینی بۆت دەردەکەوێت ئایا تاقیکردنەوەکەت باش دەگوزرێت یاخود خراپ.

بۆیە هەوڵ مەدە بە بیانووی بێ بنەمای وەك: "ئەگەر لە قەدەرمدا نمرەی نزم هەبێت، بۆ ئیدی خۆم ماندوو بکەم" خۆت لە زەحمەتی سەعیکردن بدزیتەوە.

بەپێچەوانەوە، بڕیاری دروست ئەوەیە ڕێگای دووەم هەڵبژێریت.

واتە بەخۆت بڵێیت: "من نازانم لە قەدەرم چ نووسراوە، بەڵام ئەوە باش دەزانم کە لە تاقیکردنەوەیەکدا ئەگەر سەعیم نەکردبێت بۆی، بە ئاسانی نمرەی باش بەدەستناهێنم! بۆیە ئەوەندەی بتوانم سەعیی خۆم دەکەم و، پاشان داوا لە خودا دەکەم یارمەتیم بدات لە تاقیکردنەوەکەدا باشبم" و دابنیشیت سەعییەکەت بکەیت.



# ئایا قەدەر گۆڕانکاریی بەسەردا دێت؟

لەوەتەی لەدایکبووم حەزم بە دووگۆڵی نەکردووە، لەبەر ئـەوەش بووە کە شانم نەداوەتە بەر ئەو یارییە.

لە پێشدا منداڵانی گەڕەکەکەمان زوو زوو یارییان دەکرد. هـەموو جارێکیش بـە هـۆی دوو منداڵـەوە شـەڕێك دروسـت دەبـوو. ئـەو دوو منداڵەش یەکێکیان من بووم و، ئەوی دیکەیان (جومهور)ناوێك بوو کە لە خراپترین باریدا زۆر باش یاریی دەکرد.

کاتێـك نـۆرە دەگەیشـتە سـەر جومهـور لـەکاتی هەڵبـژاردنی یاریزانەکاندا، یاریزانانی هەردوو لا دەیـانوت جـاری پێشـوو یـاری بـۆ

ئێوە کرد ئەم جارە نۆبەی خۆمانە، ئیتر قسەیەك لەم بەر دووان لەو بەر لەسەر کاکە جومهور شەڕێك سازدەبوو.

کاتێکیش نۆرە دەگەیشتە سەر من هەمان دەمەبۆڵە دەستی پێ دەکردەوە:

"جاری پێشوو یاری بۆ ئێمە کرد، هەر نەبێ با ئەم جارەیان لای ئێوە یاری بکات".

"نابێت کاکە گیان! پێش ئەوە دوو جار لەسەر یەك یاری بۆ ئێمە کرد بۆیە هەردووکیمان دۆڕاند، ئەمجارەیان نامانەوێت".

ئیدی بۆ ئەوەی کارەکە نەگاتە شەڕ و ئاژاوە ڕێکدەکەوتن لەسەر ئەوەی "شێر و خەت" بکەن.

بەڵام جاری وا هەبوو کەس پارەی ئاسنی پێنەدەبوو، بۆیە لەبری بڕیاری "تەڕ و وشکیان" دەدا.

بەردێکی تەختیان دەدۆزییەوە و، تفیان لە ڕوویەکی دەکرد، ئنجا دەیانوت: "تەڕ یان وشك هەڵدەبژێریت؟" و هەڵیاندەدا.

ئیتر هەر لایەکیان نەیانزانیایە کام لایەی بەردەکە ڕووی لە سەرەوە دەبێت ئەوا بەناچاری منیان وەردەگرت.

لەم نێوەندەدا ئەوەی زۆر کزەی لە جەرگم دەهێنا ئەوە بوو کە هەردەم من ئەو بەردانەم دەدۆزییەوە، کەچی منداڵێکی تر تفی لێدەکرد!

دەی هەرچۆنێك بێت...

پێشتریش خۆ وتم نێوانم لەگەڵ دووگۆڵیدا هەرگیز باش نەبووە، خۆ لەکۆتاییشدا وەرزشێکە.. لەم ڕۆژانەی دواییدا تەماشای یەك دوو یاریم کرد. هەرچەندە زۆر کەیفم پێیان نەهات، بەڵام خراپیش نەبوون.

بڕوا بکەن ناتوانم بڵێم هەمان بیروڕاشم بەرامبەر بە شیکەرەوەکانی دوای یارییەکە هەبێت.

تا ئێستاش تێناگەم ئەم شیکەرەوانە چۆن دەتوانن هێندە جددی بن لە چەند کاتژمێر باسکردنی یارییەك وەك ئەوەی جەنگی جیهانی بووبێت.

کەمێك بەباشی گوێم بۆ هەڵخست، گوایە: "هەڵسەنگاندن بۆ یارییەکە دەکەن" کەچی زووزوو ئەم قسانەم لێ دەبیستن:

- *ئەگەر گۆڵچییەکە تۆپەکەی بگرتایە، قەدەری یارییەکە بەجۆرێکی دیکە دەبوو.*



- *هاوڕێ گیان، ئەگەر لە خولەکی (٨٨)ی یارییەکەدا فاوڵ بگریت، دەی قەدەری پاڵەوانێتییەکە دەگۆڕیت.*
- *ئەگەر دادوەری یارییەکە دە چرکە درەنگتر فیکەی کۆتایی لێبدایە، قەدەری یارییەکە دەگۆڕا، بەڵام دەی ئەو دە چرکەیە دوای نەخست.*

باشە هەر بەڕاست قەدەر دەگۆڕرا؟

سەرەتا با ئەوە بڵێم، ئەوانەی دەڵێن قەدەر دەگۆڕێت هیچ شتێك دەربارەی قەدەر نازانن. یان ئەوەیە هەر زمانیان بە وتنی ئەو قسانە سەبارەت بە قەدەر ڕاهاتووە.

ئێستا با بێین زۆر نا کەمێك بیرمان ماندوو بکەین بە یەکێك لەم نموونانەوە، با بزانین چ بەرهەمێکمان دەبێت...

*"ئەگەر گۆڵچییەکە تۆپەکەی بگرتایە قەدەری یارییەکە دەگۆڕدرا"*.

بە پێی ئەم دەستەواژەیە بێت، گۆڵچییەکە نەیتوانیوە تۆپەکە بگرێتەوە و گۆڵی لێکراوە. ئیدی تیپەکەی یارییەکەیان دۆڕاندووە، یاخود سەرنەکەوتوون بۆ قۆناغی داهاتوو. باشە ئەگەر بیگرتایەتەوە چی دەبوو؟

لەم بارەدا ئەنجامی یارییەکەی دەگۆڕی نەك قەدەر. قەدەر گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەڵام هەمان ئەو شیکەرەوانە ئەمجارەیان دەیانوت: *"گۆڵچییەکە بە گرتنەوەی تۆپەکە قەدەری یارییەکەی گۆڕی"*، بەڵام لە ڕاستیدا قەدەر ناگۆڕدرێت. واقیع چۆن بگوزەرێت قەدەر بەو جۆرەیە.

ئەگەر گۆڵچییەکە تۆپەکە بگرێتەوە لە قەدەریدا نووسراوە کە دەیگرێتەوە، ئەگەر بە پێچەوانەشەوە بوو ئەوا لە قەدەریدا نووسراوە نایگرێتەوە.

ئێمــه چ قــەدەری گۆڵچــییەکه و چ قــەدەری یارییەکــە دوای کۆتاییهــاتنی یارییەکــە دەزانــین. ئیــدی دوای دەرکــەوتنی قــەدەری یارییەکــە مشــتومڕ کــردن لەســەر "گــۆڕان و نــەگۆڕان"ی قــەدەری یارییەکه هیچ واتایەکی نییە.

له ئەنجامدا ئەو جووڵـه کتـوپڕەی گۆڵچییەکه لـه کۆتـا خولەکدا نواندی قەدەرەکه ناگۆڕێت، بەڵکو ئەوپەڕی، مانشێتی ئەو ڕۆژنامانـە دەگۆڕێت که هێشتا یارییەکه بە کۆتا نەگەیشتووە بابەتی سبەینێیان ئامادەکردووە.

## قەدەر ناگۆڕدرێت، بارودۆخ دەگۆڕێت!

با جارێکی دیکه واتای قەدەر بەبیر خۆمان بهێنینەوە:

"زانستی خودای گەورەیە بە هەموو شتێکی ڕابردوو و داهـاتوو و، ئــەوەی ڕوویــداوە و ڕوودەدات، ئــەوەی بــەدیهاتووە و بەدیــدێت، بەدیهاتنیشیان بەگوێرەی ئەو زانستە".

بۆ نموونە: بەیانی که له خەو هەڵدەستیت هەرچییەك لـەو ڕۆژەدا دەیکەیت له قەدەری تۆدا نووسراوە.

ئەمە واتە: "ئافەرێنەر دەزانێت من ئەمڕۆ چی دەکەم".

ئەگەر ڕۆژانە ڕاهاتبوویت بە پێیان بڕۆیت بۆ قوتابخانە، بەڵام ئەو ڕۆژە باوکی هاوەڵێکت تۆی بینی و بە ئۆتۆمبێلەکەی گەیاندیتییە قوتابخانە، ناتوانیت بڵێیت: "لە کاتێکدا بە پیادە دەڕۆیشتم، قەدەرم گۆڕدرا و بە ئۆتۆمبێل گەیاندیانمە قوتابخانە".

تاکە شتێك لەم نێوەندەدا گۆڕدرابێت شێوازی ڕۆیشتنتە بۆ قوتابخانە. هەموو ڕۆژێك بە پێ هاتووچۆت دەکرد، بەڵام ئەو ڕۆژە بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشتیت. واتە لە قەدەری ئەو ڕۆژەتدا نووسراوە کە بە ئۆتۆمبێل دەچیت بۆ قوتابخانە.

– باشە ئەگەر کابرایەکی هەژار زۆر خۆی ماندوو بکات و سەروەت و سامانێك پێکەوە بنێت، قەدەری خۆی گۆڕیوە؟

– نەخێر، تەنها باری ئابووریی گۆڕیوە. واتە لە قەدەری ئەودا نووسراوە کە تا ئەو تەمەنە بە هەژاری و ڕەشوڕووتی دەژی، بەڵام دواتر کاردەکات و دەوڵەمەند دەبێت.

بەهەمان شێوە ئەگەر قوتابییێك لە وەرزی یەکەمدا لە شەش حەوت وانەدا لاوازیی هەبێت، بەڵام لە وەرزی دووەمدا ئاستی وانەکانی بەرز بکاتەوە قەدەری خۆی نەگۆڕیوە، بەڵکو باری وانەکانی گۆڕیوە.



واتە لە قەدەریدا نووسراوە لـە وەرزی یەکەمـدا ئاسـتێکی خراپـی دەبێـت، بـەڵام لـە وەرزی دووەمـدا کۆششـێکی زیـاتر دەکـات و بـە ویستی پەروەردگار ئاستی بەرز دەبێتەوە.

## ئەگەر قەدەر نەگۆڕدرێت، دەتوانین چی بکەین؟

لـە هـەر بارودۆخێکـدا بـین بـا بـبین ناکرێـت دەسـتەوئەژنۆ لێـی دابنیشـین و بڵـێین: "قەدەرەکـەمان بـەم جۆرەیـە !"، چـونکە ئێمـە نازانین قەدەرمان چۆنە.

باشە وتنی: "وا هاتووە و هەر واش دەڕوات، قەدەری ئێمە وایە" خۆهەڵقورتاندن و قسەکردن نییە بە ناوی خوداوە، لە بابەتێکدا کە تەنها زاتی ئەو دەیزانێت؟

باشە پەروەردگار ئێمەی لە زۆر بارەوە هەڵنەگەڕاندووەتە سەر زۆر باری گەلێك جیاوازی دیکە؟

ئێمە نە دەمانتوانی خۆمان لە نێو زۆر تاریکایی دەرباز بکەین، نە دەمانتوانی ساتەکانی داماوی و، ڕەشوڕووتی و، زەبوونی و، بێ بەهایی و، ترس و مەینەتی تێپەڕێنین، کەچی بەم ڕۆژگارەمان گەیشتووین.

ئێستا با بیرێك بێنین و ببەین، ئەگەر بەم عەقڵەی ئێستامانەوە لە سکی دایکماندا بووینایە ئایا دەمانتوانی بزانین کە لە قەدەرماندا ڕۆژێك لە ڕۆژان لەسەر تەپۆڵکەیەکی قەشەنگ و دڵفڕێن پێشبڕکێ لەگەڵ شنەبا بۆنخۆشەکاندا دەکەین، کۆلارە هەڵدەفڕێنین، ڕاوڕاوکێ و یاری دەکەین، بەبۆنکردنی گوڵە بەیبوون و گوێبیستبوون لە چریکەی چۆلەکەیەك دڵخۆش دەبین؟

گەر بمانوتایە: "قەدەری من ژیانە لەم تاریکستانەدا" چەندە بەهەڵەدا دەچووین!

هەزاران سوپاس بۆ ئەوزاتەی کە بوونی لـە قەدەرماندا نووسـیوە کاتێك کە هێشتا نەبووین، لە هەژارییشماندا دەوڵەمەندی دەنووسێت، لـــە تەمبەڵیشـــماندا کۆششـــکەری، ســـەرکەوتووییش لـــە شکسخواردوویماندا، لەشساغیش کاتێك نەخۆشین، شادوومانییش لـە دڵتەنگیمانـدا، لـە تەنهاییشـماندا شـادبوونەوە و، لـە برسێتیشـماندا تێری...

ئەگەر هەر بڵێین: "قەدەرمان وایـە، خـۆ قـەدەر ناگۆڕدرێـت..." و دەســتەوئەژنۆ چـاوەڕێ بکـەین، ئایـا ئــەوە ناگەیـەنێت کـە بـە پــەروەردگاری بەخشــەری ڕۆزییــەکانمان بلــێین: "تـۆ چـی دی هـیچ شتێکمان نادەیتێ"؟

گەر بکەوین دەبێت هەوڵی هەستانەوە بدەین، خـوداش دەسـتمان دەگرێت.

گەر نەمانزانی پێویستە مقۆمقۆی فێربوونمان بێت، ئافەرێنـەریش زەین و بیرمان دەکاتەوە.

گەر نەخۆش بووین دەبێت وێڵـی چارەسـەر بـین، پـەروەردگاریش شیفامان دەدات.

هەندێ جار خودای گەورە هاوتـای ویسـت و داوای خۆمانمـان پـێ دەبەخشێت، جار جاریش زۆر لە ئارەزووەکانمان زیاتر...

نەختێ جاریش هیچمان پێ نادات، بگرە ئەوەی هەشە دەیباتەوە، بەڵام لە دوارۆژدا هێندەمان جوانی و خۆشی پـێ دەبەخشـێت کـە بـە خەیاڵیشماندا نەهاتووە.

خودای گەورە دەفەرموێت: *(گەلێ گەورەیە ئەو خودایەی ئەگـەر بیەوێت چاتر لەو شتانەت دەداتێ لە دنیادا کە ئەو کافرانە دەڵێن بـۆ نییەتی. ئەو بەهەشتگەلی وات دەداتێ جۆگە و جۆباری ئاوی سافیان بەژێرا دەڕوا و چەندین کۆشك و تەلارت بۆ دروست دەکات)*. الفرقان: ١٠



# ئایا ئەگەر بەو شێوەیە نەبووایە، بەم شێوەیە دەبوو؟

یەکێك لەو "فاوڵانەی" شیکەرەوانی وەرزش زووزوو دووبارەی دەکەنەوە ئەوەیە لەسەر شتێك کە لە ئەرزی واقیعدا ڕوویداوە و تەواو بووە پێدادەگرن و دەڵێن:

"ئەگەر بەو جۆرە نەبوویایە بەم جۆرە دەبوو." بۆ نموونە:

*"ئەگەر ئەو یاریزانە چەند مەترێك لەپێشتر بووایە بە دڵنیاییەوە لەو شوێنەدا دەیتوانی گۆڵ تۆمار بکات".*

باشە بەڕاست ڕووداوەکە بەو شێوەیە دەبوو؟

لێرەدا سێ وەڵام خۆیان قووتدەکەنەوە:

١- ئەگەر یەك دوو مەترێك لە پێشتر بووایە ئەو تۆپەی بۆیان هەڵدا دەیگرتەوە و گۆڵی تۆماردەکرد.

٢- ئەگەر یەك دوو مەتریش لە پێشەوە بووایە هەر نەیدەتوانی ئەو تۆپە بگرێتەوە، گەر بیشیگرتباوە گۆڵی پێ تۆمارنەدەکرا.

٣- ناتوانین بزانین چی ڕووی دەدا گەر یەك دوو مەتر لە پێشتر بووایە، چونکە چەندین ئەگەری بێشومار هەن. وەك:

- ڕێك لەو ساتەدا دەکرا سکی بداتە ئازار و بکەوتایە سەر زەوی.

- دەکرا لەو کاتەدا هاندەرێکی دەمارگیری تیپی بەرامبەر سویچی ئۆتۆمبێلەکەی هەڵبدایە و بیکێشایە بە ناوچەوانی یاریزانەکەدا.

- ڕەنگ بوو برووسکەیەك لە قوڵایی ئاسمانەوە یاریزانەکەی لەبەر چاوی هەزاران کەسدا بکوشتایە.

- دەکرا لەناکاو ڕەشەبایەك تۆپەکەی بەرەو یاریزانێکی دیکە وێل بکردایە.

دەتوانین سەدان ئەگەری لەم شێوانە ڕیز بکەین، بەڵام ناکرێت لەدوای ڕووداوێکەوە کە براوەتەوە بڵێین: "گەر وا نەبووایە وا دەبوو"، چونکە ڕستەی "ئەگەر بەو شێوەیە نەبووایە" تەنها خودا



ئاکامەکەی دەزانێت، لەبەر ئەوە شیاوترین و ڕاستترین وەڵامیان، سێیەمیانە: (*ناتوانین بزانین چی ڕوویدەدا گەر یەک دوو مەتر لە پێشتر بووایە*، چونکە چەندین *ئەگەری بێشومار هەن*). واتە ئەوانی دیکە تەنیا پێشبینییەکی پڕوپووچن.

گەر حەز دەکەن با نموونەیەکی دیکەتان لە دەرەوەی یاریگا بۆ باس بکەم. دیمەنێك هەیە لە فیلمەکاندا زۆر دێتە پێش چاو. لە ژیانی ڕاستیشدا بۆ زۆر کەس هاتووەتە پێش.

کابرایەك لە دوایین ساتەکاندا فریای ئەو فڕۆکەیە ناکەوێت کە بلیتی بۆ بڕیبوو و، دواتر لە هەواڵەکانی ئێوارەدا دەبینێت کە فڕۆکەکە کەوتووەتە خوارەوە!

ئێستا، ئەم پیاوە دەتوانێت بڵێت: "*ئەگەر فڕۆکەکەم لە کیس نەچووایە منیش دەمردم!*". واتە بەڕاستی "ئەگەر بەو شێوەیە نەبووایە، بەم شێوەیە دەبوو"؟

ئەگەر کابراکە سەر فڕۆکەکە بکەوتایە دەمرد؟

ئەسڵی بابەتەکە: (واتە ئەوەی کە ئێمە نازانین کابراکە دەمرد یان زیندوو دەما) ئەمە تەنها خودا دەیزانێت.

ئەم خاڵە هەرچەندە سادەش دەردەکەوێت، بەڵام زۆر جێی بایەخە، چونکە هەموومان ناوبەناو سەبارەت بە قەدەر دەکەوینە بیری هەڵەوە و، بێ ئەوەی هەست بە خۆمان بکەین دەریدەبڕین.

باشە لە ژیانی ڕۆژانەماندا چۆن پێمان هەڵدەخلیسکێتە هەڵەیەکی واوە؟

ئەمجارەش با هەر لەسەر نموونەیەك بدوێین:

وا دابنێ خۆت و هاوڕێکەت بەسەر دارێکەوەن، لەناکاو کەوتنە خوارەوە و قاچی هەردووکتان شکا. یەکێکتان دەستی کرد بە نووزەنووز و لاڵانەوە:

*-ئەگەر نەچوومایەتە سەر ئەو دارە قاچم نەدەشکا، من کارم چی بوو بەسەر ئەو دارە!*

بەڵام ئەوی دیکەتان بڵێت:

*-ئەوەی دەبوو ڕووبدات ڕوویدا! چی بکەین، تەنها ویستی خودا دەبێت. دیارە لە قەدەرماندا قاچ شکانیش هەبووە.*

ئەمەی دووەمیان لەبەر ئەوەی بڕوای بە قەدەر هەبوو، لە غەم و پەژارەی ئەو بەڵایەی بەسەری هاتبوو ڕزگاری بوو، چونکە ئەو دەیزانی کە ئەوەی بەسەریدا هاتووە بە ویستی پەروەردگار بووە، بۆیە ئارامی لەسەر گرت و، خودا یار بێت پاداشتیشی لەسەر وەردەگرێتەوە.

پێغەمبەری نازدارمان ﷺ دەفەرمووێت:

*"موسوڵمانی تەوانا و هێزدار باشتر و خۆشەویستترە لە موسوڵمانی زەبوونی بێ هێز، وەلێ هەردوولا مادام موسوڵمانی باشن لەلای خودا باش و نازدارن، هەرچی قازانجی هەیە بۆت مشووری بخۆ،*

هەمیشە داوای کۆمەکی لە خودا بکە و تەمبەڵ و تەوەزەل مەبە، ئەگەر تووشی شتێ بووی، مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە وا دەبوو، بەڵام بڵێ: چارەنووسی خودا وا بوو، چارەنووسی خوداش ڕەتبوونەوەی نییە و شتێ کە لە سەرەتاوە خواستی خودای لەسەر بێت دەبێت هەر ببێت، چونکە (ئەگەر) ڕێگە و دەرگا بۆ شەیتان دەکاتەوە"[1].

---

١- صحیح مسلم: ٢٦٦٤.

## ئەگەر کەسێك لە قەدەری نووسرابێت "بەهەشتی"یە، خودا بۆچی ئەو دەنێرێتە سەر زەوی؟

## جا بۆ ڕاستەوخۆ ڕەوانەی بەهەشتی نەکات؟

ئەمە پرسیارێکی زۆر سەرنج ڕاکێشە. ڕاستییەکەی بڵێم تا تۆ ئەم رسیارەت نەکرد شتی وا بە خەیاڵمدا نەهاتبوو. مادەم وایە با ێکەوە دابنیشین و بیرێك لەم پرسیارەش بکەینەوە و بزانین ەگەینە چ ئاکامێك...

ئەگەر تۆی خوێنەر قوتابییت -یان ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر قوتابی وبیت- لەبەر ئەوە حەز دەکەم لە چوارچێوەی قوتابخانەدا نموونە ێنمەوە.

پێموابێت بەم جۆرە بۆ تۆش ئاسانتر دەبێت، چونکە وا پێویست دەکات لە نموونەی ئەو جیهانەی تێیدا دەژیت زۆر باش تێبگەیت.

لە پۆلەکەتاندا قوتابیی زۆر زیرەکی تێدایە، وانییە؟ بێگومان هەموو پۆلێك قوتابیی وای تێدایە. کەم تا زۆر هەمووان دەزانن کە ئەو هاوڕێیانەتان لە کۆتایی ساڵدا نمرەگەلێکی بێ وێنە و نایاب بەدەستدەهێنن.

ماموٚستاکانیشتان دەزانن کە ئەو قوتابییانە لە هەموو تاقیکردنەوەیەکیاندا ئەنجامی باش بەدەستدەهێنن.

باشە ئەگەر ڕۆژێك بەڕێوەبەری قوتابخانەکەتان بێتە پۆلەکەتان و دوای خوێندنەوەی ناوی یەك بە یەکی ئەو قوتابییە زیرەکانە بڵێت:

"ئێوە چی دیکە پێویست بەوە ناکات سەعی بکەن و خۆتان ماندوو بکەن، تەنانەت مەشیەنەوە بۆ قوتابخانە! چونکە ئێوە بەشداریی تاقیکردنەوەکان ناکەن. هەر ئێستا کارت و بڕوانامەکانتان پێدەدەین. خۆ هەر چۆنێك بێت خۆتان بە باشترین شێوە دەتوانن بەدەستی بهێنن".

لەو کاتەدا تۆ چ هەستێکت دەبێت؟



ئـاگر لـه جـەرگت بـەردەبێت، وانییـە مەگـەر؟ ئـاخۆ نالّێیـت:
"گیانەکەم قەیناکە ئەوان زیرەکن، بـەس خـۆ بـەم جـۆرەش نابێـت!
ئێمە لە کوێڕا زانیمـان شـایانی نمـرەی بـەرزن، بـا هـەمووومان بچینە
تاقیکردنەوەکانەوە و، ئەوانیش دانیشن و تاقیکردنەوە بکەن، ئـەوجا
کارتە باشەکانیشیان بدەنێ تا بینێنە بن باخەڵیان..."؟

هەست ناکەیت لەم کارەدا نامۆیی و نادادپەروەری هەیە؟

باشە بە ڕای تۆ قوتابییـە زیرەکـەکان بـەم پێشنیازە ڕازیـدەبن؟
ئاخۆ ئەوانیش نالّێن: "ئێمە گـەر زیـرەك بـین بۆیـە زیـرەکین چـونکە
دێین بۆ قوتابخانە، لە وانەکانماندا خۆمان ماندوو دەکـەین، تەمبـەڵی

نانوێنین، گوێڕایەڵی مامۆستاکانمانین، لە تاقیکردنەوەکاندا نمرەی بەرز بەدەستدەهێنین و لە کۆتـاییساڵیشـدا بـە بڕوانامـەی نایابـەوە دەگەڕێینەوە بۆ ماڵ... خۆ ئەگەر گشت ئەمانەمان لێزەوت بکرێت، ئیدی چ بەها و نرخێك بۆ ئەم بڕوانامانەی دەستمان مایەوە!"؟

زیرەکیی قوتابییە زیرەکەکان تا ئەو کاتە بەجێیە کە بێنـەوە بـۆ قوتابخانـە، وانـە بخـوێنن و ئـەنجامی بـاش لـە تاقیکردنەوەکانـدا بەدەستبهێنن. خۆ ئەگەر ئەم شتانە بپێچینەوە ئیدی هیچ واتایەك بۆ زیرەکییەکەیان نامێنێتەوە.

لەوە لاشەوە تەواو پێچەوانەی ئەمە بەدیدەکەین:

تەمبەڵەکان، ئەوانەی لە پۆلێکدا چەند ساڵ دەمێننەوە و هـەرگیز ناتوانن خوێندن تەواو بکـەن و بڕوانامـە بەدەسـتبهێنن. جـارێکی تـر ئەگـەر بەڕێوەبـەری قوتابخانەکـە خـۆی بکـات بـە پۆلـدا و دوای هەستاندنی ئەو قوتابییە تەمبەڵانە بۆ سەر تەختە بڵێت:

"ئیدی بـۆ هـەموو لایـەك ڕوونبووەتـەوە کـە ئێـوە نابنـە تەلەبـە. هەموومانتان بێ هیوا کـردووە! ئێـوە نـە دەتـوانن پۆلێـك بـبڕن، نـە دەشتوانن خوێندن تەواو بکەن و بڕوانامە بەدەستبهێنن.



لەبەر ئەوە چی دی لەم ناوە نەتانبینم، هەمووتانمان لە قوتابخانە وەدەرناوە. ئەمەش ئەو کارتەناموبارەکانەتانە کە لە کۆتـایی ساڵدا بەخزمـەتیان دەگـەن! لـە هیچـی خـۆڕایی لێـرە ڕێ و شـوێنمان لێمـەگرن"! ئیـدی خوێنـدکارەکان لـە قوتابخانــە دەربکـرێن. ئەمجارەیان چۆن هەستێکت دەبێت؟

هەر نەبێت ئەمە ناچێتە باری نادادگەرییەکی گەورەوە؟

ئەی ئەو قوتابییە تەمبەڵانە ڕەخنە ناگرن و بڵـێن: "باشـە ئەگـەر ئێمە نەیەین بۆ قوتابخانە و بەشداریی تاقیکردنەوەکان نەکەین چۆن دەزانن کە تەمبەڵ دەردەچین؟ باشە با بڵێین قسەکانی تـۆ هـەمووی

ڕاستن، باشە ئەمە بەناوی دادپەروەرییەوە بە ئێمە ڕەوایە؟"؟ لە کاتێکدا بۆخۆشیان وەك ڕۆژی ڕووناك دەزانن کە تەمبەڵن، ئاخۆ نایکەنە هەرا و هاوار بکەن: "ئێمە ستەممان دەرهەق کراوە! نادادگەریمان لەگەڵ دەنوێنن!"؟ بەلام گەر لە تاقیکردنەوەکاندا خۆیان بە هەڵە وەلام بدەنەوە، ئیدی کەسیان ماف ڕەخنە گرتنیان نەدەبوو، چونکە هەم خۆیان و هەم دەوروبەرەکەشیان تێدەگەیشتن کە چەند تەمبەڵ و سەرەڕۆن.

ئێستا با ئەم نموونەیە بکەینە دووربینێك و لێیەوە لە پرسیارەکەمان بڕوانین.

با تەماشایەك بکەین و هەوڵبدەین وەلامێك پەیدا بکەین...

## لە دونیادا هەمووان بە ئاواتی چوونە بەهەشتەوە دەژین

دەی باشە کێ و کێ دەچنە بەهەشتەوە؟

ئەوانەی لەم دنیایەدا ژیانێکی باشیان بەڕێکردووە، ئەو کارانەیان کردووە کە خودا لێیان ڕازییە و چەندێکی توانیبێتیشیان لەو کارانە

خۆیان پاراستووه که پەروەردگار لێیان ڕازی نییه. ئەوانەی هەوڵ و تەقەلایان داوه بۆ ئەنجامدانی ئەو شتانەی خودا فەرمانی به کردنیان کردووه و له دەست قەدەغەکراوەکانیشی خۆیان پاراستووه.

ئەوانەی هەر کات باش و خراپ، تاوان و پاداشت، سوودبەخش و زیانبەخش، حەڵاڵ و حەرام ڕووبەڕوویان دەبێتەوه بوێری دەنوێنن تا باشەکەیان، پاداشتەکەیان، سوودبەخش و حەڵاڵەکەیان هەڵبژێرن.

ئەوانەی کاتێك بە لای دەرگای ناهەقیدا تێدەپەڕن ناهەقی بەرامبەر کەس نانوێنن، کاتێك نادادپەروەری لە دەرگایان دەدات خۆیانی لێدەخلافێنن، کاتێك هەلی ستەمکردنیان دەبێت خۆیانی لێدەپارێزن.

هەرکەسێك وته و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەرانی بیستبێت و، گوێڕایەڵی ئایەتەکانی قورئان بووبێت.



ئەوانەی لە دەوڵەمەندیدا سوپاسگوزار بوون، سامانەکەیان لەگەڵ هەژاراندا دابەشکردووە و هەرگیز بە سکی تێرەوە سەریان نەناوەتە سەر سەرین لە کاتێکدا هاوسێکەیان برسی بووبێت.

ئەوانەی لە ساتە سەخت و ناهەموارەکاندا ئارامیان گرتووە و، هەرگیز ناڕەزاییەکیان لە قەدەری پەروەردگاردا دەرنەبڕیوە.

ئەوانەی هەرگیز بە ئەنقەست پێیەکیان بە مێرووله‌یەکدا نەناوە.

ئەوانەی زوو زوو یادی ناوە پیرۆزەکانی پەروەردگار دەکەن و پەرستشەکانیان بەجێدەهێنن.

ئەوانەی ئامۆژگاریی باشی خەڵکیان کردووە و هەوڵیانداوە لە ناڕەحەتی و ئازار دووریان بخەنەوە.

بازرگانە چاکەکارەکان و فرۆشیارە دەستپاك و دڵفراوانەکان.

گومانی تێدا نییە کە بەدیهێنەر دەزانێت کێ دەچێتە بەهەشت، بەڵام گەر ئەو بەندانەی شیاوی بەهەشتن ڕاستەوخۆ بیخستنایەتە بەهەشتەوە و لە دنیادا کەمەکێك ژیانیان نەگوزەراندایە، ئەم تابلۆ جوانانە لەسەر زەوی نەدەنەخشاند.

دەزانن ئەمە لە چی دەچێت؟ لەو تۆوانە دەچێت کە پەروەردگار دەزانێت لە قەدەریاندا بوون بە چ گوڵێك نووسراوە، بەڵام لێیان دەگەڕێت بە تۆوی بمێننەوە.

ئەگەر بڕوانین بوونی ئەو تۆوانە بە گوڵە بەیبوونێك، بە گوڵە مێخەکێك، بە گوڵە باخێك، بە گوڵاڵەسوورەیەك چەندە شتێکی جوان دەبوو.

ئافەرێنەرێك کە دەنکە تۆوێك هەر بە تۆوی جێناهێڵێت تا نەکرێتەوە و وەك یاقوتێك نەدرەوشێتەوە و جوانییەکەی نەنەخشێنێت، دیارە کە ئارەزوو دەکات بەندە بەهەشتییەکانیشی جوانییەکانیان لە دنیادا بپشکوێن و ڕەنگ بدەنەوە.

ئارەزوو دەکات کە بڕوا بە بەدیهێنەری نەبینراویان بکەن. سوجدەی بۆ ببەن و لێی بپاڕێنەوە...

دەخوازێت ببینێت و ئامادەشیان بۆ بکات کاتێك کە خۆیان بەدوور دەگرن لە قەدەغەکراوەکانی، فەرمانەکانی دەخەنە سەر چاویان، بە حەڵاڵکراوەکانی قایل دەبن، خۆیان لە حەرامکراوەکان بە دوور دەگرن، دادپەروەرن، ئەو نیعمەتانەی پێیانبەخشراوە لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا دابەشیان دەکەن و لە کاتی ناڕەحەتییەکاندا ئارامدەگرن.

ئیدی هەر لەبەر ئەمەشە کە بەندەکانی دەنێرێتە مەیدانی تاقیکردنەوەیەکی واوە، چونکە لە دنیاوە ڕێی بەرەو بەهەشت دەگیرێتەبەر.

مەرجی چوونە بەهەشتیش: "باوەڕهێنان و کردنی کاری باشە".

ئەگەر خودا بەندە بەهەشتییەکانی ڕەوانەی دنیا نەکردایە، ئەی ئەوان ئەم کارە جوانانەیان لە کوێ دەکرد؟ (نموونەی قوتابییە زیرەکەکان وەبیر خۆت بهێنەوە ! )



بەو پێیەی لە بەهەشتدا شتێك نییە بە ناوی پەرستش، یا هەڵبژاردن لە نێوان چاك و خراپدا؛ کەوایە دەبوو شوێنێکی دیکە جگە لە بەهەشت بۆ ئەم کارانە بڕەخسێندرایە، وانییە مەگەر؟

سەرەڕای ئەوەش کەسێك کە لەپاش ژیانی دنیاوە چووبێتە بەهەشت بەهای بەهەشتی گەلێ لا زۆرترە لەوەی هەر لە بەهەشتدا چاوانی هەڵهێناوە.

ئایا دەگونجێت بەهای بەهەشت لای کەسێك کە ساردی و گەرمی، نەداری و زەبوونی، نەخۆشی و برسێتی، بێهیوایی و نائومێدی، پەژارە و لێکدابڕان، نەمانی کات ، ستەم و نادادگەری و هەموو شتێکی دیکەی نەبینیبێت، لەگەڵ کەسێکی دیکەدا کە کەم تا زۆر تامی هەر یەك لەمانەی چەشتووە وەك یەك بێت؟

ئەوانەی لەم دنیاوە ڕێی بەرەو بەهەشت دەگرنەبەر بەباشی لە بەهای بەهەشت دەگەن و، هەر ئەوانەش بەباشی سوپاسگوزاری پەروەرێنیان دەبن و ستایشی دەکەن. پشتیوان بە خودا ئێمەش یەکێك دەبین لەوانە.



## ئەی ئەوانەی دەچنە دۆزەخەوە؟

هەندێ جار پۆلیسەکان لە نێوچاوانی کەسێکەوە وەك ناوی خۆیان دەزانن کە تاوانێك دەکات، بەڵام خۆ ناشتوانن بڵێن: "ئەم کابرایە تاوانێکی بە نێوچاوەوەیە و، با هەر ئێستا بیگرین و بەندی بکەین!" تەنانەت دادپەروەریی کەموکورتی مرۆڤانەش ئەمەی پێ ڕەوا نییە.

ئەگەر بە ڕەواشی دابنێیت، ئەوا لە هیچی خۆڕایی و تەنها لەبەر ئەوەی گوایە وەك ستەمکارێك قۆڵبەست دەکرێت، ستەملێکراو دەردەچێت.

ئەم جۆرە ستەملێکراوانە دەڵێن: " ئێمە چ تاوانێکمان کردووە وا لە بەندییان ناوین و گیرۆدەی ئەم سزایانەیان کردووین؟".

ئەمەش کتومت وەك وەدەرنانی ئەو قوتابییە تەمبەڵانەیە کە پێشتر هەمووان دەیانزانی چەند ناپەسەنن. واتە ئەمانیش وەك ئەوان دەست دەکەنە هاوار هاوار و کڕووزانەوە.

بەڵێ، هیچ کەسێکی دادپەروەر ڕێگە بەمە نادات. دەی باشە لە کاتێکدا مرۆڤە دادگەرەکان ڕێگە بەمە نەدەن، ئەو پەروەرێنەی هەستی دادگەریی بە مرۆڤەکان بەخشیوە هەرگیز ڕێ دەدات ستەمکارێکی وا ئەو ستەمەی بەسەرەوە بچێت؟

بێ گومان نەخێر...

ئیدی دوای کۆتایی هاتنی ئەم ژیانی دنیایە هەرچی کاروکردەوەیانە دەیانخاتە بەردەستیان.

*خودای گەورە دەفەرموویت: (لەو ڕۆژەدا ئادەمزاد پۆل پۆل لە گۆڕەکانیان دێنەدەر تا جەزای کاروکرداری دنیای خۆیان ببینن* جا هەرکەسێ بە قورسایی گەردیلەیێ چاکەی کردبێ پاداشەکەی دەبینێت و* هەرکەسیش بە قورسایی گەردیلەیێ خراپەی کردبێت سزاکەی دەبینێت)* الزلزلة: ٦-٨.

خودای گەورە دەفەرمووێت: (ئەوە پێغەمبەرێکتان نەهاتە لا لەم ڕۆژەتان بترسێنێ؟ * ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ وەڵڵا. بەڕاستی پێغەمبەرمان هاتەسەر و لەم ڕۆژەی ترساندین، بەڵام ئێمە باوەڕمان پێنەکرد و بە درۆزنمان دانا و وتمان: حاشا خودا هیچ ئایەتێکی نەناردووەتە خوار. ئێوە، ئەی ئەوانەی خۆتان بە فروستادەی خودا دادەنێن، لە گومڕاهییەکی گەورەدان) الملك: ٨-٩.

# بوومەلەرزە و ڕووداوی سروشتی قەدەرە یاخود نا؟

هەرکاتێك گوێم لە مشتومڕێك بێت سەبارەت بە بوومەلەرزە یەکسەر گوێیەك هەڵدەخەم بزانم چ باسە. گەر هەواڵێك لە ڕۆژنامەکاندا بکەوێتە پێش چاوم لەبارەیەوە، هەمووشی نەخوێنمەوە چاوێکی هەر بەسەردا دەگێڕم. تەنانەت ئەگەر لە ئینتەرنێتیش-کە هەزار هەواڵی بەتاڵە و یەکی بەکارە- هەواڵێك سەبارەت بە بوومەلەرزە ببینم ناتوانم سەرنجی نەدەمێ.

لەبەر ئەوە زۆر باش تێدەگەم بۆچی ئەم پرسیارەت ئاڕاستە کردووم. دەزانم ئەوانەی دەیانخوێنیتەوە و دەیانبینیت و دەیانبیستیت مێشکییان ئاڵۆز کردوویت.

## (بوومەلەرزە)ش قەدەرە، وەکو هەر شتێکی دیکە..

با وەك هەر بەشێکی پێشووتری ئەم کتێبە جارێکی دیکە واتای قەدەر بەبیرخۆمان بهێننەوە.

– ئەریٚ قەدەر چی بوو؟

– "زانستی خودای گەورەیە بە هەموو شتێکی ڕابردوو و داهاتوو، ئەوەی ڕوویداوە و ڕوودەدات، ئەوەی بەدیهاتووە و بەدیدێت لە ئاسمان یاخود ڕێسمان، لە مێروولەیەکەوە تا مرۆڤێك، لە دەنکە لمێکەوە تا ئەستێرەکان لە هەموو بارێکیاندا، بەدیهاتنیشیان بەگوێرەی ئەو زانستە".

ئەمە بوو وانییە؟

کەوابوو، هەرکێ بڵێت: "بوومەلەرزە قەدەر نییە؟" ئەوا یان خودا ناناسێت، یان نازانێت قەدەر چییە، چونکە بەپێی ئەو پێناسەیەی کردمان تەنانەت گەڵایەکیش ناتوانێت بێ فەرمانی خودا لە لقەکەی ببێتەوە و بکەوێتە خوارەوە.

*خودای گەورە دەفەرمووێت: (کلیلی شتە نهێنییەکان لای خودایە، ئەو نەبێت کەس نایانزانێت. خودا هەرچی لە وشکانی و لە دەریادایە*

*پێی دەزانێت. گەڵایەك ناكەوێتە خوار ئەو پێی نەزانێت. هەرچی دانەوێڵە لە ناخی تاریكی توێی زەویدایە، هەرچی تەڕە و هەرچی وشكە هەمووی لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوە و دیاری كراوە)* الأنعام: ٥٩.

باشە گەر گەڵایەك دوور لە زانستی خودا و بێ فەرمانی ئەو نەكەوێتە خوارەوە، ئایا دەگونجێت پارچە و بەشی گەورەی هێندەی شار و وڵات و تەنانەت قارەكانیش لە جێی خۆیان بجووڵێن؟

زەوی هەر لە خۆیەوە لە دەوری خۆر لە نموونەییترین دووریدا بۆ ژیانی زیندەوەرانی سەری دەخوولێتەوە.

ئەی مانگ، ئەویش هەر لە خۆیەوەیەتی...؟

باشە ئەی خۆر-كە ئەستێرەیەكە لە كۆی (٢٠٠-٤٠٠) ملیار ئەستێرەی ڕێگای كاكێشان- هەر لەخۆیەوە لە پارێزراوترین خاڵی گەلەئەستێرەكەدا جێگیر بووە و بێ كەمتەرخەمی ئەركی خۆی بەجێدەگەیەنێت.

لە كاتێكدا لەسەر هیچ كام لە هەسارەكانی دیكەی كۆمەڵەی خۆر ئاسەوارێك لە ژیان بوونی نییە، تەنانەت مانگیش -كە نزیكترین تەنە لە زەوییەوە- دوورە لە ئاهەنگی ژیان و لەوپەڕی تەنیاییدایە، بەڵام

سەر ئـەم زەمینـەی خۆمـان لـە بەسـتەڵەکەکانییەوە تـا بیابانـەکانی لێوان لێوە لە چریکەی ژیان و ئاهەنگی زیندوویی.

ئەمە هەر بە ڕێکەوت وا ژیانی تێکەوت؟ هـەر لـە خۆیـەوە زینـدوو هەڵکەوت؟

چـــینی بەرگـــە هـــەوای زەوی هـــەر لـــە خۆیـــەوە و بەڕێکـــەوت پێکهاتەیـەکی بـۆ دروسـتبوو کـە تیشـکە هاتووەکـان لـە خـۆرەوە هەڵبمژێت و بە ئەندازەیەك بیداتەوە کە بـۆ هـەموو زینـدەوەران –لـە پەپوولەیەکەوە تا فیلێك– لە گونجاوترین باردا بێت؟

درەختـەکان بـە ئـارەزووی خۆیـان بڕیاریـان داوە کـە بـەیانی تـا ئێوارە ڕۆشنەپێکهاتن بکەن؟

بەڕێکەوت ئۆکسجینی بەرگە هـەوا لـە ڕێژەیەکدایـە کـە دەتـوانین هەڵیبمژین؟ سییەکانمان بەڕێکەوت وا هەڵکەوتوون کە ئـەو هەوایـەی بەردەم لووتمان هەڵبمژن؟

ملیۆنەها سیکڵدانۆچکەی سییەکانمان بەڕێکەوت هێندە هەستیارن کە دوانەئۆکسیدی کـاربۆنی نێـو خوێنمـان کۆدەکەنـەوە و لـە برییـدا ئۆکسجینی تازە و سازگار دادەنێن؟

هەوا لە بارێکدایە کە دەکرێت هەڵبمژدرێت.. ئاو بۆ خواردنەوە دەشێت.. سێو بۆ خواردنمان گونجاوە.. ئەمە هەر لە خۆیانەوەیە؟ بەڕێکەوت وا دەرچوون؟!

پەڕەی گوڵەکان و باڵەکانی پەپوولەکان بەڕێکەوت وا بە ڕەنگ و بۆیەی قەشەنگ و سەرنجڕاکێش ڕازێندراونەتەوە؟

**لەم دنیایەدا هیچ شتێك لە خۆیەوە نابێت.**

نە گەڵایەك لە خۆیەوە لە لقەکەی دەبێتەوە، نە پارچە زەبەلاحەکانی شار و وڵات و قارەکان لە خۆیانەوە دەخزێن و دەبزوون... چونکە هەموو شتێك قەدەرێکی هەیە.

قەدەریش زانستی خودای گەورەیە بە هەموو شتێکی ڕابردوو و داهاتوو، ئەوەی ڕوویداوە و ڕوودەدات، ئەوەی بەدیهاتووە و بەدیدێت لە ئاسمان تاکو ڕێسمان، لە مێروولەیەکەوە تا مرۆڤێك، لە دەنکە لمێکەوە تا ئەستێرەکان لە هەموو بارێکیاندا، بەدیهاتنیشیان بەگوێرەی ئەو زانستەیە.

**بوومەلەرزە قەدەرە، بەلام قەدەریش مانای ئەوە نییە ئیتر ئێمە پاڵی لێبدەینەوە و بڵێین قەدەرە.**

ئەو تاقمەی دەڵێن: *"بوومەلەرزە قەدەر نییە!"*، با خوداش بناسن، دڵنیام سەبارەت بە قەدەر هیچ نازانن.

ئەگەر پێیان بڵێین: *"بێگومان بوومەلەرزەش وەك هەر شتێکی دیکە قەدەرە"* بەم جۆرە بەرهەڵستیتان دەکەن:

*"ئەمە چییە دەڵێن بوومەلەرزە قەدەرە! بوومەلەرزە قەدەر و شت نییە. ئەگەر خانوو و بینای قایم و چاك دروست بکەین، ئیدی بوومەلەرزە لە قەدەری و شتی وا دەردەچێت!"*.



ئەوانەشی کە بوومەلەرزە بە قەدەر دەزانن خۆ نالێن:

"*چی بکەین، بۆخۆمان دەستەوئەژنۆ دادەنیشین. جا دەکرێت خۆ لە بوومەلەرزە بە دوور بگیردرێت؟ چ چارێکمان هەیە جگە لە پشتبەستن بە خودا؟*"! هەر نەبێت هیچ موسڵمانێك کە باوەڕی بە خودا و بە قەدەر هەبێت و، بەشی خۆی ژیریی هەبێت شتی لەم جۆرەی بەسەر زاردا نایەت، چونکە باوەڕبوون بە قەدەر هەوڵنەدان و پاڵدانەوە و ڕاکشان نییە، بەڵکو سەرەتا هەوڵدان پاشان تەوەککولە.

"تەوەککول" واتە متمانە بوون بە خودا، دانانی زاتی ئەوە بە بریکار لە هەموو کارێکدا و باوەڕبوونە بەوەی: "با بزانین خودا چۆنی دەکات، هەرچۆنی بکات باشی دەکات".

ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی سەردەمی خۆشگوزەرانی پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری ئازیز ﷺ و لێی پرسی:

"*ئایا وشترەکەم ببەستمەوە و پشت بە خودا ببەستم، یان نەیبەستمەوە و تەنها پشت بەخودا ببەستم؟* پێغەمبەی خۆشەویست

ﷺ پێی فەرموو: *وشترەکەت بەباشی ببەستەوە، پاشان پشت بە خودا ببەستە!"*[1]

پێغەمبەرمان ﷺ ڕێگەی بەم پیاوە نەدا وشترەکەی بێ ساحێب لەدەرەوە بەجێبهێڵێت و بڵێت: "پشتم بە خودا بەست"، بەڵکو فێری کرد ئەوە بکات کە لە دەستی دێت بۆ ئەوەی وشترەکەی ون نەبێت و، سەری خۆی هەڵنەگرێت و دیارنەمێنیت، بەڵام دواتریش فەرمانی پێکرد کە پشت بە خودا ببەستێت.

پشتبەستن بە خودا بێ گرتنەبەری هیچ هەوڵ و کارقایمییەك شتێکە لە ژیانی پێغەمبەرماندا ﷺ نەبووە. ئەو پێشەوایە لە جەنگەکاندا قەڵغانی دەبەست، سەربازەکانی بە باشترین شێوە جێگیر دەکرد و هەر هەوڵێکی بۆ بدرایە درێخیی لێنەدەکرد. پاشان پشتی بە خودا دەبەست و، چاوەڕوانی ئاکامەکانی تەنهاوتەنها لە زاتی ئەو دەکرد. لە زاتی پەروەردگار دەپاڕایەوە و، چاکە و پاداشت و تەندروستیی لەو زاتە داوا دەکرد.

---

[1] - سنن الترمذي: ٦٦٨.

وانەی "تەوەككول" كە ئازیزمان فێری كردووین بەمجۆرە بووە: (هەر كارقایمییەكمان بە بیردا بێت، لەبەر چاوانمان بێت و بەدەستەكانمان تواناماان بەسەریدا بشكێت دەیگرینەبەر، پاشان پشت بە خودا دەبەستین)،

لە ڕاستیدا ئەگەر خودا ویستی لەسەر پارێزراویی وشترەكەت نەبێت، تۆ بچۆ بە چل پەت بیبەستەوە هەر لەوێ دەڕوات. بۆ نموونە دەكرێت دز بیبات. هەر نەبێ نەبێ ئاژەڵەكە ئەجەلی دێت و دەمرێت.

ئەگەر لە ناوچەیەكدا بژین كە لە ژێر هەڕەشەی بوومەلەرزەدایە، ئەوا پێویستە چەندی لە تواناماندا بێت ماڵەكانمان پتەو و بەهێز بنیات بنێین، كەلوپەلەكانیشمان وا دابنێین كە بە ئاسانی نەكەون و نەشكێن.

پێویستە بەر لەوە بزانین كاتێك بوومەلەرزە ڕووی دا چی بكەین و چی نەكەین. چەند هەنگاو هەبێت بۆ خۆپاراستن لە بوومەلەرزە -كە كەس نازانێت كەی و لە كوێ ڕوو دەدات- دەبێت هەر بیگرینە بەر. واتە دەبێت وشترەكەمان بە پتەوترین گوریس كە بۆمان پەیدا بكرێت، بە بەهێزترین میخ كە بۆمان دەست دەدات و بە قایمترین گرێ ببەستینەوە و، پاش ئەمە ئنجا پشت بە خودا ببەستین.

"ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێت) فەرمووی: عومەر (ڕەزای خودای لێ بێت) کەوتەڕێ و چوو بۆ شام، کە گەیشتە سەرغ، لەوێ هەموو فەرماندارەکانی سەر گەورە شارەکانی شام هاتن بەپیرییەوە کە بریتی بوون لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرڕاح و هاوڕێکانی، عەرزیان کرد کە وا تاعوون لە شام بڵاوبووەتەوە، جا عومەر فەرمووی بە من: هاوەڵە کۆچکارە پێشینەکانم بۆ بانگ بکە، منیش بانگم کردن، جا عومەر بۆ ئەم باسە ڕاوێژی پێ کردن بەڵام قسەیان یەك نەبوو، هەندێکیان دەیانوت: تۆ هاتووی بۆ کارێکی وا، لەبەر ئەوە بە باشی نازانین کە نەچی و بگەڕێیتەوە، هەندێکی تریان دەیانوت: تۆ هاوڕێیانی پێغەمبەر و خەڵکی تریشت لەگەڵدایە، لەبەر ئەوە ئێمە بە باشی نازانین کە بیانبەیت بۆ ناو ئەم پەتایە، عومەریش فەرمووی: دەورم چۆڵ کەن.

ئنجا بە منی فەرموو یاریدەدەران (أنصار)ەکانم بۆ بانگ بکە، منیش بانگیانم کرد بۆی، ڕاوێژی بەوانیش کرد، ئەوانیش وەك کۆچکاران ڕایان یەك نەبوو، جا بەوانیشی فەرموو: دەورم چۆڵ کەن.

ئنجا فەرمووی: کێ لێرەیە لە پیرەمێردانی قوڕەیش ئەوانەی کە لە کاتی ئازادکردنی مەککەدا کۆچیان کردووە، ئەوانەم بۆ بانگ بکە،

جا کە بانگم کردن سەرجەم وتیان: ئێمە ڕامان وایە کە خەڵکەکە بگێڕیتەوە بۆ دواوە و نەیانبەیت بۆ ناو ئەم پەتایە.

ئیتر عومەر جاڕی دا بەناو عەشاماتەکەدا کە سبەینێ سەرلەبەیانی سواردەبین و دەگەڕێینەوە بۆ مەدینە، ئەبو عوبەیدەش فەرمووی: ئایا لەدەست چارەنووسی خودا هەڵدێین؟ عومەر فەرمووی: "ئەبو عوبەیدە! خۆزگە کەسێکی تر ئەم قسەیەی بکردایە". عومەر حەزی نەدەکرد کە بێ دڵیی ئەبو عوبەیدە بکا، ئنجا فەرمووی: "بەڵێ لەدەست چارەنووسی خودا ڕادەکەین بۆ لای چارەنووسی خودا خۆی! ئەی پێم بڵێ: ئەگەر تۆ ڕانێ وشترت هەبێ و بچیتە ناو دۆڵێکەوە کە دوو باڵی لاپاڵی هەبێ، لاپاڵێکیان بژوێن و ئەوەکەی تریان چەقەن و ڕەقەن بێ، جا ئەگەر ئەو ڕانە لە لاپاڵە بژوێنەکەدا بلەوەڕێنیت هەر بە چارەنووسی خودا نییە و ئەگەر لە لاپاڵە ڕەقەنەکەشدا بیلەوەڕێنیت هەر بە چارەنووسی خودا نییە؟".

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف هات بەسەر ئەم مشتومڕەدا -کە لەوەو پێش لەوێ نەبوو و، چوو بوو بۆ هەندێ ئیشی خۆی-، ئەو هات فەرمووی: من شارەزاییم لەم باسە هەیە، لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: کاتێ بیستتان کە وا تاعوون لە جێگەیێ بڵاوبووەتەوە

مەچن بۆ لای بۆ ئەویّ و بە پێی خۆتان مەچن بەپیرییەوە، کاتێ لەو جێگەیەش بڵاوبووەوە کە ئێوەی لێن دەرمەچن لەوێ و لە دەستی ڕامەکەن. ئیتر عومەر سوپاس و ستایشی خودای کرد و گەڕایەوە بۆ مەدینە و سەفەرەکەی بڕی و نەچوو بۆ شام"[1].

عومەری کوڕی خەتتاب (خودا لێی ڕازی بێت) نەیوت: "ئەگەر لە قەدەرماندا تووشبوون بە تاعوون نووسرابێت، بچینە شام یان نا هەر تووش دەبین، دەی ئیتر با بڕۆین بزانین چی دەبێت"، چونکە لە ئیسلامدا ئەم جۆرە تێگەیشتنە بەرامبەر بە قەدەر نەبووە. بەڵکو فەرمووی: "بەڵێ لەدەست چارەنووسی خودا ڕادەکەین بۆ لای چارەنووسی خودا خۆی". بەم وتەیەی ئاماژەی بە هەڵهاتنی لە تاعوون کرد و، بەجوانیش ڕوونی کردەوە کە ئەمە بە واتای هەڵهاتن لە قەدەر نایەت.

ئەگەر ئێمە خەمی بوومەلەرزەمان بێت ئەوا پێویستە ماڵەکانمان بەوپێیە قایم و پتەو دروست بکەین. تەنانەت ئەگەر زۆر دووریش بین لە ناوچەکانی ژێر مەترسیی بوومەلەرزەوە با هەر کارقایم بین. خۆ

---

١- صحيح البخاري: ٥٧٢٩

ئەگـەر لـە قەدەرمانـدا نووسـرابێت کـە بـە بوومەلـەرزە زیانێکمـان پێدەگات ئەوا گومانی تێدا نییە ناتوانین خۆمانی لێدەرباز بکەین.

بۆ نموونە گەر لە پتەوترین خانووی دنیادا بـژین، کـەس ناتوانێـت بە تەواوی لە مەترسیی بوومەلەرزە دڵنیامان بکاتەوە، لەبەر ئـەوە چ هەنگاوێکمان بۆ گیردرایە بەر ئامادەدەبین بۆی و، پشت بـە خـوداش دەبەستین.

وەك حەزرەتی عومەر فەرمووی: لە قەدەری خوداوە بـۆ قـەدەری زاتی ئەو هەڵدێین و پشتی پێدەبەستین.



*"پـەروەردگارا! ئێمـە ئـەوەی لـە دەستمان هات کردمان، تـۆش ئـەم هەوڵانـەمان وەك نزایەك لێوەربگرە و، ئێمە لە بوومەلـەرزە و ئافاتە جۆر بە جۆرەکانی دیکە بپارێزە.*

*بڕوامان بە تۆ هێناوە و پشت بە تۆ دەبەستین.*

*ئەگەر فـەرمان و خواسـت و دانسـتی تـۆ نـەبێت تاکـە مێشوولەیەك ناتوانێت پێمانەوە بدات.*

*بەدیهێنەری میهرەبان، تۆ بمانپارێزە!*

هەموو ئەو بڕیارانەی دەرهەق بە ژیانم دەیاندەیت بیانکە بە خێر و چاکەگەلێك بۆ ژیانی دنیا و ژیانی نەبڕاوەی دوارۆژمان، کە نە چاوەکان بینیبێتیان و، نە گوێیەکان بیستبێتیان و نە بەسەر هیچ بیر و دڵێکدا هاتبێت.

لەم دنیایەدا باشەمان پێ ببەخشە، لە دوارۆژیش باشەمان پێ ببەخشە.

بمانگێڕە لەو بەندانەت کە لە دەوڵەمەندییاندا سوپاسگوزارن و لە هەژاری و نەدارییشییاندا لە ئارامگرانن..."





# سەرجەم کتێبەکانی زنجیرەی تامەزرۆم

بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟

خودا بۆچی گەردوونی بەدیهێنا؟

تامەزرۆی ناسینی پێغەمبەرم

تامەزرۆی تێگەیشتنی قورئانم

تامەزرۆی ناسینی بەهەشتم

تامەزرۆی تێگەیشتنی قەدەرم

**تامەزرۆی ناسینی فریشتەکانم (بەم زووانە)**